لە چارەکە دیناریٚ کەمتر بێت، هەندیٚ لە خەڵکی کوفە دەڵێن: نابیٚ لە دە درهەم کەمتر بێت.

### باسێکی تر لەوبارەوە

### ٢٣ - بَابٌ مِنْهُ

١١١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عِيسَى، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ نَافِعٍ الصَّائِغُ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: إِنِّي وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ، فَقَامَتْ طَوِيلاً، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَزَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ، فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا؟ فَقَالَ: مَا عِنْدِي إِلاَّ إِزَارِي هَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِزَارُكَ، إِنْ أَعْطَيْتَهَا جَلَسْتَ، وَلاَ إِزَارَ لَكَ، فَالتَمِسْ شَيْئًا؟ قَالَ: مَا أَجِدُ، قَالَ: فَالتَمِسْ، وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ قَالَ: فَالتَمَسَ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ شَيْءٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، سُورَةُ كَذَا، وَسُورَةُ كَذَا، لِسُوَرٍ سَمَّاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ ذَهَبَ الشَّافِعِيُّ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ شَيْءٌ يُصْدِقُهَا فَتَزَوَّجَهَا عَلَى سُورَةٍ مِنَ القُرْآنِ، فَالنِّكَاحُ جَائِزٌ، وَيُعَلِّمُهَا سُورَةً مِنَ القُرْآنِ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: النِّكَاحُ جَائِزٌ، وَيَجْعَلُ لَهَا صَدَاقَ مِثْلِهَا، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الكُوفَةِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتووم خۆم ببەخشم بە تۆ، ئەویش

ماوەیەکی زۆر وەستا، پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر خۆت پێویستت پێی نیە لەمنی مارە بڕە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا هیچت هەیە کە بیکەیتە مارەیی؟). وتی هیچم نیە ئەم بەرکۆشەم نەبێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر بەرکۆشەکەتی بدەیتێ خۆت بێ بەرکۆش دەمێنیتەوە، بگەڕێ بۆ شتێکی تر). وتی: هیچ شك نابەم، فەرمووی: (بگەڕێ ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت باشە). ئەویش گەڕا هیچی نەدۆزیەوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (لە قورئان چیت پێیە چی دەزانیت؟). وتی: بەڵێ سورەتی ئەوەو ئەوە، چەند سورەتێکی ناوبرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەوا لێم مارەم کردی لەسەر ئەو قورئانەی کە دەیزانیت فێری بکەیت).

١١١٤م– (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي العَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا صَدُقَةَ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللهِ لَكَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا عَلِمْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَكَحَ شَيْئًا مِنْ نِسَائِهِ وَلاَ أَنْكَحَ شَيْئًا مِنْ بَنَاتِهِ عَلَى أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو العَجْفَاءِ السُّلَمِيُّ: اسْمُهُ هَرِمٌ. وَالأُوقِيَّةُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَرْبَعُونَ دِرْهَمًا وَثِنْتَا عَشْرَةَ أُوقِيَّةً أَرْبَعُ مِائَةٍ وَثَمَانُونَ دِرْهَمًا.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ئاگاداربن زیادەڕەوی مەکەن لە مارەیی ئافرەتاندا، چونکە ئەگەر مایەی ڕێز بوایە بۆ دونیا، یان هۆکاری تەقواو لەخواترسان بوایە بۆ دواڕۆژ، ئەوا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەپێشتر بوو بۆ ئەوە لەئێوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مارەیی نەکردوە بۆ هیچ یەکێك لە خێزانەکانی، وە مارەییش نەکراوە بۆ هیچ

یەکێك لە کچەکانی زیاتر بێت لە دوانزە ئوقیە چوار سەدو هەشتا درهەم.

## کەسێ کەنیزەکەی خۆی ئازاد بکات لەپاشدا مارەی بکات.

٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَعْتِقُ الأَمَةَ ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا

١١١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا. وَفِي البَاب عَنْ صَفِيَّةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يُجْعَلَ عِتْقُهَا صَدَاقَهَا، حَتَّى يَجْعَلَ لَهَا مَهْرًا سِوَى العِتْقِ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم صەفیەی ئازاد کرد، ئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی و مارەی کرد بۆ خۆی.

## فەزڵ و گەورەیی ئازادکردنی کەنیزە و مارەکردنی

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفَضْلِ فِي ذَلِكَ

١١١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الفَضْلِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: عَبْدٌ أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، فَذَاكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ جَارِيَةٌ وَضِيئَةٌ فَأَدَّبَهَا، فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا، ثُمَّ

تَزَوَّجَهَا يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللهِ، فَذَلِكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ، وَرَجُلٌ آمَنَ بِالكِتَابِ الأَوَّلِ، ثُمَّ جَاءَ الكِتَابُ الآخَرُ فَآمَنَ بِهِ، فَذَلِكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سێ كەس دوو پاداشتیان بۆ هەیە: بەندەیە مافی خواو مافی گەورەكەی جێبەجێ بكات، ئەمە دوو پاداشتی بۆ هەیە، كەسێ كەنیزەیەكی جوانی هەبێ ئەدەبی دا بدات و پەروەردەی بكات بەجوانی، لەپاشدا لەبەر رەزامەندی خوای گەورە ئازادی بكات و مارەی بكات، ئەمەش دوو پاداشتی بۆ هەیە، پاداشتی ئازادكردنەكەی و پاداشتی مارەكردنەكەی، كەسێ بڕوای بە نامەیەكی ئاسمانی هەبێ، لەپاشدا خوای گەورە نامەیە بنێرێ بۆ پەیامبەرێكی تر بڕوا بەویش بهێنێ ئەمەش دوو پاداشتی بۆ هەیە). - بۆ نمونە كەسێ بڕوای بە عیسا هێنابێ، لەپاشدا بڕوای هێنابێ بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم -.

١١١٦ (م) - حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحٍ، وَهُوَ ابْنُ حَيٍّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. حَدِيثُ أَبِي مُوسَى حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى: اسْمُهُ عَامِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ، وَرَوَى شُعْبَةُ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحِ بْنِ حَيٍّ، وَصَالِحُ بْنُ صَالِحِ بْنِ حَيٍّ هُوَ وَالِدُ الحَسَنِ بْنِ صَالِحِ بْنِ حَيٍّ.

**كەسێ ژنێ مارەبكات پێش ئەوەی بچێتە لای تەلاقی بدات**

**ئایا بۆی حەلاڵە كچەكەی مارەبكات یان نا؟**

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ ثُمَّ يُطَلِّقُهَا

قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا هَلْ يَتَزَوَّجُ ابْنَتَهَا أَمْ لاَ؟

١١١٧ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً فَدَخَلَ بِهَا، فَلاَ يَحِلُّ لَهُ نِكَاحُ ابْنَتِهَا، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ دَخَلَ بِهَا، فَلْيَنْكِحْ ابْنَتَهَا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً فَدَخَلَ بِهَا أَوْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا فَلاَ يَحِلُّ لَهُ نِكَاحُ أُمِّهَا. هَذَا حَدِيثٌ لاَ يَصِحُّ مِنْ قِبَلِ إِسْنَادِهِ، وَإِنَّمَا رَوَاهُ ابْنُ لَهِيعَةَ، وَالمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، وَالمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ، وَابْنُ لَهِيعَةَ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ امْرَأَةً ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، حَلَّ لَهُ أَنْ يَنْكِحَ ابْنَتَهَا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الاِبْنَةَ فَطَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا لَمْ يَحِلَّ لَهُ نِكَاحُ أُمِّهَا لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: (وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ)، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

**واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خـوای لـێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسـێ ژنێ مارەبكات و بچێتە لای ئەوە بۆی حەلاڵ نیە كچەكەی مارەبكات، بەلاّم ئەگەر نەچووە لای بۆی حەلاڵە، هەركەسێ ژنێ مارەبكات بچێتە لای و نەچـێتە لای بـۆی حەلاڵ نیە دایكی مارەبكات).**

**بە پەیڕەوكردنی فەرموودەكە زۆربـەی زانایـان دەفـەرموون: ئەگـەر كەسـێ ژنـێ مارەبكـات پـێش ئـەوەی بچـێتە لای تـەلاقی بـدات ئـەوە بـۆی حەلاڵـە كچـەكەی مارەبكات، بەلاّم ئەگەر كەسێ كچەكەی مارەبكات پێش ئەوەی بچێتە لای تەلاقی بـدات ئـەوە بـۆی حـەلاڵ نیـە دایكـی مارەبكـات، لەبـەر ئـەم ئایەتـە: (وَأُمَّهَاتُ**

نِسَائِكُمْ). واتە: دایکانی ژنەکانتان - بۆتان حەڵا نیە مارەیان بکەن -، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## دەربارەی کەسێ ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق بدات، کەسێکی تر مارەی بکات پێش ئەوەی بچێتە لای تەڵاق بدات

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا فَيَتَزَوَّجُهَا آخَرُ فَيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا

١١١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَإِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ القُرَظِيِّ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي، فَبَتَّ طَلاَقِي، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ وَمَا مَعَهُ إِلاَّ مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ، فَقَالَ: أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَالرُّمَيْصَاءِ أَوْ الغُمَيْصَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا فَتَزَوَّجَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ فَطَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا أَنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِلزَّوْجِ الأَوَّلِ إِذَا لَمْ يَكُنْ جَامَعَ الزَّوْجُ الآخَرُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: ژنەکەی ریفاعە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتی: من ژنی ریفاعە بووم، سێ بە سێ تەڵاقی دام، شووم کرد بە (عبد الرحمن)ی کوڕی زوبێر، ئێستا هینەکەی وەك چمکی پۆشاك وایە توانای ئەنجامدانی کاری جوتبوونی نیە، فەرمووی: (ئەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ریفاعە؟ نا ئەوە هەرگیز حەڵاڵ نیە هەتا شیرنی یەکتر نەچێژن واتە هەتا لەگەڵ یەك جوت نەبن بە شێوەیە کە خۆشتن واجب

بكات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مارەکردنی حەڵاڵ کردنەوە

### ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُحِلِّ وَالمحَلَّلِ لَهُ

١١١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْعَثُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زُبَيْدٍ الأَيَامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُجَالِدٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَعَنْ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالاَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ الْمُحِلَّ وَالمحَلَّلَ لَهُ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَلِيٍّ وَجَابِرٍ حَدِيثٌ مَعْلُولٌ، وَهَكَذَا رَوَى أَشْعَثُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ عَامِرٍ هُوَ الشَّعْبِيُّ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، وَعَامِرٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَهَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَائِمِ، لأَنَّ مُجَالِدَ بْنَ سَعِيدٍ قَدْ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَرَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَلِيٍّ وَهَذَا قَدْ وَهِمَ فِيهِ ابْنُ نُمَيْرٍ، وَالحَدِيثُ الأَوَّلُ أَصَحُّ وَقَدْ رَوَاهُ مُغِيرَةُ، وَابْنُ أَبِي خَالِدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەفرینی خوای گەورە لەسەر ئەو کەسە بێت کە ژنێك دەهێنێت بۆ ئەوەی حەلاڵی بکاتەوە بۆ مێردە کۆنەکەی، وە نەفرینی خوای گەورەش لەو پیاوە بێت کە ژنی بۆ حەلاڵ دەکرێتەوە). — واتە: مارە بە جاش -.

١١٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُحِلَّ وَالمحَلَّلَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو قَيْسٍ الأَوْدِيُّ: اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ ثَرْوَانَ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، وَغَيْرُهُمْ، وَهُوَ قَوْلُ الفُقَهَاءِ مِنَ التَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَسَمِعْتُ الجَارُودَ يَذْكُرُ، عَنْ وَكِيعٍ أَنَّهُ قَالَ بِهَذَا. وقَالَ: يَنْبَغِي أَنْ يُرْمَى بِهَذَا البَابِ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الرَّأْيِ. قَالَ جَارُودُ: قَالَ وَكِيعٌ: وَقَالَ سُفْيَانُ: إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ لِيُحَلِّلَهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يُمْسِكَهَا فَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُمْسِكَهَا حَتَّى يَتَزَوَّجَهَا بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرینی کردووە لە کەسێ ژنێك بهێنێت بۆ ئەوەی حەلاڵی بکاتەوە بۆ مێردە کۆنەکەی، وە نەفرینی لەو کەسەش کردووە کە بە مارە بە جاش ژنەکەی بۆ حەلاڵ دەکرێتەوە.

## سەبارەت بە حەرامبوونی هاوسەرگیری کاتی[1].

## ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَحْرِيمِ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ

١١٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، وَالحَسَنِ، ابْنَيْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِمَا، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ، وَعَنْ لُحُومِ الحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ. وَفِي البَاب عَنْ سَبْرَةَ الجُهَنِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ وَإِنَّمَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ شَيْءٌ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي الْمُتْعَةِ، ثُمَّ رَجَعَ عَنْ قَوْلِهِ حَيْثُ أُخْبِرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَأَمْرُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ عَلَى تَحْرِيمِ الْمُتْعَةِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەزەمانی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا هاوسەرگیری کاتی و خواردنی گۆشتی کەرەکێوی قەدەغەکرد.

زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش پەیڕەوی ئەمە دەکەن. بێگومان لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ شتێ دەربارەی روخسەت دەگێڕنەوە، بەڵام لەپاشدا لە وتەکەی پەشیمان بۆتەوە، کاتێ کە فەرموودەکەی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم پێ ڕاگەیاند. فەرمانی زۆربەی زانایان لەسەر حەرامبوونی هاوسەرگیری کاتیە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیبنو موبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

---

[1] (نِكَاحِ الْمُتْعَةِ): بریتە لە هاوسەرگیری کاتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کاتێ کە ماوەکە تەواو بوو ئیتر جیادەبنەوە.

١١٢٢ - (منكر) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُقْبَةَ، أَخُو قَبِيصَةَ بْنِ عُقْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّمَا كَانَتِ الْمُتْعَةُ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْبَلْدَةَ لَيْسَ لَهُ بِهَا مَعْرِفَةٌ فَيَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ بِقَدْرِ مَا يَرَى أَنَّهُ يُقِيمُ فَتَحْفَظُ لَهُ مَتَاعَهُ، وَتُصْلِحُ لَهُ شَيْئَهُ، حَتَّى إِذَا نَزَلَتِ الآيَةُ: (إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ)، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَكُلُّ فَرْجٍ سِوَى هَذَيْنِ فَهُوَ حَرَامٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لەسەرەتای ئیسلامەوە هاوسەرگیری کاتی بوونی هەبوو، کاتێ پیـاوێ بـە سـەفەری دەچووە وڵاتێکەوە کەسی نەدەناسی ئافرەتێکی مارە دەکرد بۆ ئەو ماوەیـەی لـەوێ دەمایـەوە، بـۆ پارسـتنی شمەکـەکانی و بـەڕێوەبردنی کارەکـانی هـەتا ئـەم ئایەتـە دابـەزی: (إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ). سورة المؤمنون: ٦. واتــە: مەگـەر لەگـەڵ هاوسەری خۆیان، یـان لەگـەڵ کـەنیزانیان. جـا ئیبنـو عـەباس فـەرمووی: هـەموو شەرمگەیە حەرامە جگە لەم دووانە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی ژن بە ژن

٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ نِكَاحِ الشِّغَارِ

١١٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ وَهُوَ الطَّوِيلُ، قَالَ: حَدَّثَ الْحَسَنُ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ جَلَبَ، وَلاَ جَنَبَ، وَلاَ شِغَارَ فِي الإِسْلاَمِ، وَمَنِ انْتَهَبَ نُهْبَةً فَلَيْسَ مِنَّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَاب عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي رَيْحَانَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَمُعَاوِيَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ.

واتـە: لـە عیمرانـی کـوڕی حوصـەینەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( نە (جلب) و نە (جنب) هیچیان دروست نین) - (لەگرەوی پێشبڕکێدا)، (جلب) ئەوەیە کەسێك دوای ئەسپەکەی بکەوێ بۆ ئەوەی هانی بدات و پێش بکەوێت، (جنب)یش ئەوەیە کە ئەسپێکی تری بێ سوار لەگەڵ خۆی بەرێت کاتێ کە ئەسپەکەی ماندو بوو سواری ئەوەی تریان ببێت — ژن بە ژن لە ئسلامدا نیە، هەرکەسێ ماڵێ بە ناهەق وەرگرێ بۆ خۆی ئەوە لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە).

١١٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ نِكَاحَ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ: أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، أَوْ أُخْتَهُ، وَلاَ صَدَاقَ بَيْنَهُمَا. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: نِكَاحُ الشِّغَارِ مَفْسُوخٌ، وَلاَ يَحِلُّ وَإِنْ جُعِلَ لَهُمَا صَدَاقًا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَرُوِيَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ أَنَّهُ قَالَ: يُقَرَّانِ عَلَى نِكَاحِهِمَا وَيُجْعَلُ لَهُمَا صَدَاقُ الْمِثْلِ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ژن بە ژنی قەدەغەکردووە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئافرەت مارە ناکرێت بەسەر پوریدا.

## ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَلاَ عَلَى خَالَتِهَا

١١٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ أَبِي حَرِيزٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ تُزَوَّجَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوْ عَلَى خَالَتِهَا. وَأَبُو حَرِيزٍ: اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ حُسَيْنٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قەدەغەیكردووە ئافرەت مارە بكرێت بەسەر پوریدا ئیتر خوشكی باوكی بێ یا دایكی. - واتە: حەلاڵ نیە ئافرەتێك لەگەل پوری لەیەك كاتدا ژنی پیاوێ بن -.

١١٢٥ (م) - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِهِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَسَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ.

١١٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَنْبَأَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَامِرٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوِ العَمَّةُ عَلَى ابْنَةِ أَخِيهَا، أَوِ الْمَرْأَةُ عَلَى خَالَتِهَا، أَوِ الخَالَةُ عَلَى بِنْتِ أُخْتِهَا، وَلاَ تُنْكَحُ الصُّغْرَى عَلَى الكُبْرَى، وَلاَ الكُبْرَى عَلَى الصُّغْرَى. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ اخْتِلاَفًا: أَنَّهُ لاَ يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، أَوْ خَالَتِهَا، فَإِنْ نَكَحَ امْرَأَةً عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا، أَوِ العَمَّةَ عَلَى بِنْتِ أَخِيهَا، فَنِكَاحُ الأُخْرَى مِنْهُمَا مَفْسُوخٌ، وَبِهِ يَقُولُ عَامَّةُ أَهْلِ العِلْمِ. أَدْرَكَ الشَّعْبِيُّ أَبَا هُرَيْرَةَ وَرَوَى عَنْهُ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا، فَقَالَ: صَحِيحٌ. وَرَوَى الشَّعْبِيُّ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە ئافرەت مارە بکرێت بەسەر پوریدا ئیتر خوشکی باوکی بێ یا دایکی، هەروەها پور مارە بکرێ بەسەر برازاو خوشکەزای خۆیدا، وە بچوك بەسەر گەورەدا، یان گەورە بەسەر بچوکدا.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای سەرجەم زانایان پێ نازانم رایان جیاواز بێ بە هیچ شێوە حەڵاڵ نیە ئافرەت مارە بکرێت بەسەر پوریدا ئیتر خوشکی باوکی بێ یا دایکی، هەروەها قەدەغەیکردووە پور مارە بکرێ بەسەر برازاو خوشکەزای خۆیدا، هەرکامیان مارە کرا بەسەر ئەوی تریاندا ئەوە مارەکردنەکەی باتڵە، بەڵام مارەکردنی یەکەم دروستە، ئەمەش وتەی سەرجەم زانایانە.

## سەبارەت بە مەرجەکانی گرێبەستی هاوسەرگیری

### ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّرْطِ عِنْدَ عُقْدَةِ النِّكَاحِ

١١٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ مَرْثَدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ اليَزَنِيِّ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوفَى بِهَا مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الفُرُوجَ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان شیاوترین ماف کە ئێوە پابەند بن پێوەی و جێبەجێی بکەن ئەو مەرج و بەڵێنانەن کە بەهۆیەوە ئافرەتانتان لە خۆتان حەڵاڵ کردووە).

١١٢٧ (م) - حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ

أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ قَالَ: إِذَا تَزَوَّجَ رَجُلٌ امْرَأَةً وَشَرَطَ لَهَا أَنْ لاَ يُخْرِجَهَا مِنْ مِصْرِهَا فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُخْرِجَهَا، وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَرُوِي عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ قَالَ: شَرْطُ اللهِ قَبْلَ شَرْطِهَا كَأَنَّهُ رَأَى لِلزَّوْجِ أَنْ يُخْرِجَهَا وَإِنْ كَانَتْ اشْتَرَطَتْ عَلَى زَوْجِهَا أَنْ لاَ يُخْرِجَهَا، وَذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَبَعْضِ أَهْلِ الكُوفَةِ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوێ موسوڵمان بێ و دە ژنی هەبێ

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ وَعِنْدَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ

١١٢٨ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ غَيْلاَنَ بْنَ سَلَمَةَ الثَّقَفِيَّ أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَأَسْلَمْنَ مَعَهُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَتَخَيَّرَ أَرْبَعًا مِنْهُنَّ. هَكَذَا رَوَاهُ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: هَذَا حَدِيثٌ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، وَغَيْرُهُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حُدِّثْتُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ، أَنَّ غَيْلاَنَ بْنَ سَلَمَةَ أَسْلَمَ وَعِنْدَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَإِنَّمَا حَدِيثُ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَجُلاً مِنْ ثَقِيفٍ طَلَّقَ نِسَاءَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَتُرَاجِعَنَّ نِسَاءَكَ أَوْ لأَرْجُمَنَّ قَبْرَكَ كَمَا رُجِمَ قَبْرُ أَبِي رِغَالٍ. وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ غَيْلاَنَ بْنِ سَلَمَةَ عِنْدَ أَصْحَابِنَا مِنْهُمُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە غەیلانی کوڕی سەلەمە موسوڵمان بوو دە ژنی سەردەمی نەفامی هەبوو، هەر هەموویان لەگەڵ ئەو موسوڵمان بوون، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمانی پێ کرد چواریان هەڵبژێرێ. — لەبەرئەوەی لە ئیسلامدا تا چوار ژن بەسەریەکەوە دروستە -.

## دەربارەی پیاوێ موسوڵمان بێ و دوو خوشك ژنی بن

٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ وَعِنْدَهُ أُخْتَانِ

١١٢٩ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ أَبِي وَهْبٍ الْجَيْشَانِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ فَيْرُوزَ الدَّيْلَمِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ.

واتە: لە فەیروزی دەیلەمیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من موسوڵمان بووم و دوو خوشك پێکەوە هاوسەرمن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموو: (یەکێکیان هەڵبژێرە بە ئارەزووی خۆت).

١١٣٠ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ أَيُّوبَ، يُحَدِّثُ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي وَهْبٍ الْجَيْشَانِيِّ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ فَيْرُوزَ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، قَالَ: اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو وَهْبٍ الْجَيْشَانِيُّ: اسْمُهُ الدَّيْلَمُ بْنُ هَوْشَعَ.

واتە: لە (ضحاك)ی کوڕی فەیروزی دەیلەمیەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من موسوڵمان بووم و دوو خوشك پێکەوە هاوسەرمن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموو: (یەکێکیان هەڵبژێرە بە ئارەزووی خۆت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوێ کەنیزەیە بکڕێ سکی پڕ بێ

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الجَارِيَةَ وَهِيَ حَامِلٌ

١١٣١ - (حسن) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ الشَّيْبَانِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ بُسْرِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَسْقِ مَاءَهُ وَلَدَ غَيْرِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَرَوْنَ لِلرَّجُلِ إِذَا اشْتَرَى جَارِيَةً وَهِيَ حَامِلٌ أَنْ يَطَأَهَا حَتَّى تَضَعَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە رووەیقیعی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ بچێتە لای ئافرەتی سك پڕ). - لەریوایەتی ئەبو داودا بەم شێوەیە هاتووە: (هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ بە ئاوی خۆی نەمامی کەسێکی تر ئاو بدات) - .

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زانایان ڕایان وایە: ئەگەر پیاوێ کەنیزەیە بکڕێ سکی پڕ بێ بۆی نیە بچێتە لای هەتا سکەکەی دانەنێ.

## پیاو ژنی (سەبایا)ی خاوەن مێردی بەرکەوت ئایا بۆی حەلاڵە بچێتە لای؟

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَسْبِي الأَمَةَ وَلَهَا زَوْجٌ هَلْ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَطَأَهَا

١١٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ البَتِّيُّ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: أَصَبْنَا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطَاسٍ وَلَهُنَّ

أَزْوَاجٌ فِي قَوْمِهِنَّ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَتْ: (وَالمحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَهَكَذَا رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ البَتِّيِّ، عَنْ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبُو الخَلِيلِ: اسْمُهُ صَالِحُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ. وَرَوَى هَمَّامٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ صَالِحٍ أَبِي الخَلِيلِ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ الهَاشِمِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژی حونەین لەشکرێکی نارد بۆ سەر (أَوْطَاس)، دەگەن بە دوژمنەکانیان و جەنگیان لەگەڵ دەکەن و، سەردەکەون بەسەریانداو هەندێ ژنی خاوەن مێردیان بە دیل لێ دەگرن - هەندێ لە هاوەڵان ناوێرن بچنە لای ئەو ژنە دیلانە، گوایە ئەوانە مێردیان هەیەو مێردەکانیشیان هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرن - خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ) سورة النساء: ٢٤. واتە: (هەروەها حەرام کراوە لێتان) ئەوانەی کەمێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان (کەنیزەك).

واتە: ئەو ژنە دیلانە کە عیددەی شەرعیان تەواو بوو ئیتر دروستە بۆ خاوەنە موسوڵمانەکانیان بچنە لایان.

### قەدەغەکردنی مارەیی ئافرەتی زیناکار

### ٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ مَهْرِ البَغِيِّ

١١٣٣ - (صحیح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ ثَمَنِ الكَلْبِ، وَمَهْرِ البَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الكَاهِنِ. وَفِي البَاب عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ أَبِي مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئـەبو مەسـعودی ئەنصـاریەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لـە كـرێ و نـرخ و بەهای سەگ و، مارەیی ئافرەتی زیناكار و، كولەنانی فالْ گرتنەوە.

## نابێ كەس خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بكات

## ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ أَنْ لاَ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ

١١٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قُتَيْبَةُ: يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ أَحْمَدُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلاَ يَخْطُبُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ. وَفِي البَاب عَنْ سَمُرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ قَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: إِنَّمَا مَعْنَى كَرَاهِيَةِ أَنْ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ: إِذَا خَطَبَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَرَضِيَتْ بِهِ فَلَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَخْطُبَ عَلَى خِطْبَتِهِ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ لاَ يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ هَذَا عِنْدَنَا: إِذَا خَطَبَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَرَضِيَتْ بِهِ وَرَكَنَتْ إِلَيْهِ فَلَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَخْطُبَ عَلَى خِطْبَتِهِ، فَأَمَّا قَبْلَ أَنْ يَعْلَمَ رِضَاهَا أَوْ رُكُونَهَا إِلَيْهِ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَخْطُبَهَا. وَالحُجَّةُ فِي ذَلِكَ حَدِيثُ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ حَيْثُ جَاءَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَتْ لَهُ أَنَّ أَبَا جَهْمِ بْنَ حُذَيْفَةَ وَمُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ خَطَبَاهَا، فَقَالَ: أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَرَجُلٌ لاَ يَرْفَعُ عَصَاهُ عَنِ النِّسَاءِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ، وَلَكِنْ انْكِحِي أُسَامَةَ. فَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَنَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ: أَنَّ فَاطِمَةَ لَمْ تُخْبِرْهُ بِرِضَاهَا بِوَاحِدٍ مِنْهُمَا، وَلَوْ أَخْبَرَتْهُ لَمْ يُشِرْ عَلَيْهَا بِغَيْرِ الَّذِي ذَكَرَتْ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، قوتەیبە فەرمووی: فەرموودەكەی بەرزكردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەحمەد فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نابێ پیاو مامەڵە بكات بەسەر مامەڵەی براكەیدا، هەروەها نابێ خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بكات، مەگەر خوازبێنی كەری پێشو وازی هێنابێ یان ئەو رێگەی بدا).

پێشەوا مالیكی كوڕی ئەنەس دەفەرمووێ: بێگومان مانای (نابێ كەس خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بكات) ئەمەیە: ئەگەر پیاوێ داوای ژنێكی كرد و رازی بوو، ئیتر بۆ كەس دروست نیە خوازبێنی لەسەر خوازبێنی بكات، پێشەوا شافیعی دەفەرمووێ: مانای (نابێ كەس خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بكات) لای ئێمە ئەمەیە: ئەگەر پیاوێ داوای ژنێكی كرد و رازی بوو، مەیلی بۆی هەبوو، ئیتر بۆ كەس دروست نیە خوازبێنی لەسەر خوازبێنی بكات، بەڵام پێش ئەوەی ئاگاداربێ بەو حاڵەتە داوای بكات دروستە، بە بەڵگەی فەرموودەكەی (فاطمة)ی كچی قەیس كە هاتووە، باسكرا كە ئەبو جەهم و موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان داوای (فاطمة)ی كچی قەیسیان كرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڵام ئەبو جەهم گۆچانەكەی سەرشانی دانانێتە سەرزەوی — واتە توڕەیەو لە ژن دەدات — ، موعاویەش پیاوێكی هەژارە و ماڵو سامانی نیە، شوو بكە بە ئوسامەی كوڕی زەید). مانای فەرموودەكە لای ئێمە (خوا بۆ خۆی دەیزانێ)، (فاطمة)ی كچی قەیس رەزامەندی خۆی بۆ هیچ كامیان پێ رانەگەیاند، ئەگەر پێی رابگەیاندایە، ئاماژەی بە جگە لەوە نەدەكرد.

١١٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي الجَهْمِ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ

الرَّحْمَنِ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ فَحَدَّثَتْنَا، أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، وَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً، قَالَتْ: وَوَضَعَ لِي عَشَرَةَ أَقْفِزَةٍ عِنْدَ ابْنِ عَمٍّ لَهُ، خَمْسَةً شَعِيرًا ، وَخَمْسَةً بُرًّا، قَالَتْ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، قَالَتْ: فَقَالَ: صَدَقَ، قَالَتْ: فَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ بَيْتَ أُمِّ شَرِيكٍ بَيْتٌ يَغْشَاهُ الْمُهَاجِرُونَ، وَلَكِنْ اعْتَدِّي فِي بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَعَسَى أَنْ تُلْقِي ثِيَابَكِ وَلاَ يَرَاكِ، فَإِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُكِ فَجَاءَ أَحَدٌ يَخْطُبُكِ فَآذِنِينِي، فَلَمَّا انْقَضَتْ عِدَّتِي خَطَبَنِي أَبُو جَهْمٍ، وَمُعَاوِيَةُ، قَالَتْ: فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ لاَ مَالَ لَهُ، وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَرَجُلٌ شَدِيدٌ عَلَى النِّسَاءِ. قَالَتْ: فَخَطَبَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَتَزَوَّجَنِي، فَبَارَكَ اللَّهُ لِي فِي أُسَامَةَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي الْجَهْمِ نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ، وَزَادَ فِيهِ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: انْكِحِي أُسَامَةَ. حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي الْجَهْمِ بِهَذَا.

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی ئەبو جەهمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من ئەبو سەلەمەی کوڕی (عبد الرحمن) چووین بۆ لای (فاطمة)ی کچی قەیس، بۆی باسکردین کە مێردەکەی سێ بە سێ تەڵاقی داوەو، شوێنی حەوانەوەی نیەو، ڕۆزی بۆ دابین ناکات، (فاطمة) فەرمووی: لای ئامۆزاکەی دە (أَقْفِزَة)م بۆ دادەنێ، پێنجی گەنم و پێنجی جۆ (أَقْفِزَة) پێوانەیەکی ئەو کاتە بووە، منیش چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ڕاست دەکات - خەرجیت ناکەوێتە سەری -). (فاطمة) فەرمووی: فەرمانی پێدام لەماڵی ئوممو شەریکدا عیددە تەواو بکەم، لەپاشدا پێی فەرمووم: (ئوممو شەریك ئافرەتێکی باش و لەخوا

ترس و ناندەرەو میوانی زۆرە هاوەڵانم لە کۆچەران هاتوچۆی دەکەن، بەڵکو بچۆ بۆ ماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم لەوێ عیددە تەواو بکە، چونکە ئەو پیاوێکی کوێرە تۆ نابینێ، کاتێ کە جلەکانت دادەنێی لەماڵەکەیدا، کاتێ کە عیددەشت تەواو کردو کەسێ هاتە خوازبێنیت ئاگادارم بکەرەوە). جا کە عیددەکەم تەواو بوو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم هاتنە خوازبێنیم، (فاطمة) فەرمووی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (موعاویە پیاوێکی هەژارە و ماڵ و سامانی نیە، ئەبو جەهمیش پیاوێکی زۆر توڕەیەو لە ژن دەدات). (فاطمة) فەرمووی: داوای کردم بۆ ئوسامەی کوڕی زەید و، منیش شوم پێ کرد، خوای گەورە خێر و بێرێکی زۆری بەسەردا رشتین.

### ئەوەی هاتووە سەبارەت بە (عزل)

٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَزْلِ

| ١١٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا نَعْزِلُ، فَزَعَمَتِ اليَهُودُ أَنَّهَا الْمَوْءُودَةُ الصُّغْرَى، فَقَالَ: كَذَبَتِ اليَهُودُ، إِنَّ اللهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهُ فَلَمْ يَمْنَعْهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَالبَرَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ. |
|---|

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، ئێمە عەزل دەکەین - واتە: کاتێ کە دەچینە لای هاوسەرانمان لەکاتی نزیك بونەوەی ئاو هاتنەوەدا خۆمان دەکێشینەدواوە بۆ ئەوەی تۆوەکە نەچێتە ژورەوە و سکیان پڕ نەبێت- ، جولەکەکانیش دەڵێن: (عزل) کچ زیندە بەچاڵکردنی بچوکە، پێغەمبەری خوا صلی

ترس و ناندەرەو میوانی زۆرە هاوەڵانم لە کۆچەران هاتوچۆی دەکەن، بەڵکو بچۆ بۆ ماڵی ئیبنو ئوموو مەکتوم لەوێ عیددە تەواو بکە، چونکە ئەو پیاوێکی کوێرە تۆ نابینێ، کاتێ کە جلەکانت دادەنێی لەماڵەکەیدا، کاتێ کە عیددەشت تەواو کردو کەسێ هاتە خوازبێنیت ئاگادارم بکەرەوە). جا کە عیددەکەم تەواو بوو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم هاتنە خوازبێنیم، (فاطمة) فەرمووی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (موعاویە پیاوێکی هەژارە و ماڵ و سامانی نیە، ئەبو جەهمیش پیاوێکی زۆر توڕەیەو لە ژن دەدات). (فاطمة) فەرمووی: داوای کردم بۆ ئوسامەی کوڕی زەید و، منیش شوم پێ کرد، خوای گەورە خێر و بێرێکی زۆری بەسەردا رشتین.

### ئەوەی هاتووە سەبارەت بە (عزل)

٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَزْلِ

١١٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا نَعْزِلُ، فَزَعَمَتِ اليَهُودُ أَنَّهَا الْمَوْءُودَةُ الصُّغْرَى، فَقَالَ: كَذَبَتِ اليَهُودُ، إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهُ فَلَمْ يَمْنَعْهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَالبَرَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە عەزل دەکەین - واتە: کاتێ کە دەچینە لای هاوسەرانمان لەکاتی نزیک بونەوەی ئاو هاتنەوەدا خۆمان دەکێشینەدواوە بۆ ئەوەی تۆوەکە نەچێتە ژورەوە و سکیان پڕ نەبێت- ، جولەکەکانیش دەڵێن: (عزل) کچ زیندە بەچاڵکردنی بچوکە، پێغەمبەری خوا صلی

الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (جولەکـه درۆ دەکـەن، ئەگـەر خـوای گـەورە بیـەوێت دروستی بکات تۆ ناتوانی قەدەغەی بکەیت).

١١٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ وَالقُرْآنُ يَنْزِلُ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ وَقَدْ رَخَّصَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي العَزْلِ وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: تُسْتَأْمَرُ الحُرَّةُ فِي العَزْلِ، وَلاَ تُسْتَأْمَرُ الأَمَةُ.

واتـە: لـە جـابیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: ئێمـە (عزل)مان دەکرد لەکاتێکدا قورئانیش دادەبەزی - واتە ڕێگری لێ نەدەکردین - .

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـه وسـلم و جگـە لـەوانیش مۆڵـەتیان داوە بـە (عزل)کـردن، پێشـەوا مالیـك دەفـەرمووێ: ئـافرەتی کەنیزە فەرمانی پێ دەکرێت بە (عزل)، بەڵام ئافرەتی ئازاد فەرمانی پێ نـاکرێ بـە (عزل)کردن.

## سەبارەت بە (عزل) کە باش نیە

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ العَزْلِ

١١٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ قَزَعَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: ذُكِرَ العَزْلُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: لِمَ يَفْعَلُ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ: زَادَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ فِي حَدِيثِهِ، وَلَمْ يَقُلْ: لاَ يَفْعَلْ ذَاكَ أَحَدُكُمْ، قَالاَ فِي حَدِيثِهِمَا: فَإِنَّهَا لَيْسَتْ نَفْسٌ مَخْلُوقَةٌ إِلاَّ اللَّهُ خَالِقُهَا. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ

مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَقَدْ كَرِهَ العَزْلَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم باسی عزل کرا، فەرمووی: (بۆچی کەسێ لە ئێوە ئەو کارە دەکات). ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: نەیفەرموو: (هیچ کەسێ لە ئێوە ئەو کارە نەکات) هەردوو راوی لە فەرموودەکەدا فەرموویان: (چونکە بێگومان ئەو نەفسەی کە خوای گەورە بڕیار بدات بەدیبهێنێ هەر بەدی دەهێنێت ئیتر کەسێ لە ئێوە (عزل) بکات یان نا).

## سەبارەت بە مانەوەی تازە زاوا لای کچ و بێوەژن

## ٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القِسْمَةِ لِلْبِكْرِ وَالثَّيِّبِ

١١٣٩ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَكِنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ البِكْرَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَفَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ وَلَمْ يَرْفَعْهُ بَعْضُهُمْ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ امْرَأَةً بِكْرًا عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، ثُمَّ قَسَمَ بَيْنَهُمَا بَعْدُ بِالعَدْلِ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ: إِذَا تَزَوَّجَ البِكْرَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا لَيْلَتَيْنِ وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: ئەگەر بڵێم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەها دەفـەرموێت ئەوە ڕاست دەکـەم، بـەڵام نـەیوت: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم وەهـا دەفەرموێت، بەڵکو وتی: سوننەت بەم شێوەیە: ئەگەر تازە زاوا کچی هێنـا بەسـەر بێوەژندا حەوت ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە ئینجا دابەشـی بکـات، بـەڵام ئەگـەر بێـوەژنی هێنا بەسەر کچدا سێ ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە پاشان دابەشی بکات.

## دابەشکردنی کاتی مانەوەی پیاو لای ژنەکانی بە یەکسانی

٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الضَّرَائِرِ

١١٤٠ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَيَعْدِلُ، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ هَذِهِ قِسْمَتِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ. حَدِيثُ عَائِشَةَ هَكَذَا رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْسِمُ، وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ مُرْسَلاً، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْسِمُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه کاتی مانەوەی خۆی لەلای ژنـەکانی بـەداد و یەکسـانی دابـەش دەکـردو، دەیفەرموو: (خودایە ئەمە دابەشکردنی منە لەو شـتەدا کـە لەدەسـەڵاتی منـدایـە، سا خوایە لێم مەگرە سەبارەت بە شـتێك کـە لەدەسـەڵاتی تۆدایـە) — کـە ئـەویش

خۆشویستن و ئارەزووی دڵە لەدەسەڵاتی مندا نیە- .

١١٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا كَانَ عِنْدَ الرَّجُلِ امْرَأَتَانِ فَلَمْ يَعْدِلْ بَيْنَهُمَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ سَاقِطٌ. وَإِنَّمَا أَسْنَدَ هَذَا الْحَدِيثَ هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ قَتَادَةَ، وَرَوَاهُ هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الْحَدِيثَ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ هَمَّامٍ، وَهَمَّامٌ ثِقَةٌ حَافِظٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر پیاوێ دوو ژنی هەبێ لەگەڵیاندا دادپەروەر نەبێ، ئەوە ڕۆژی قیامەت کە دێت بۆ مەیدانی مەحشەر لایەکی خوارە).

ژن و مێردێکی هاوبەش بۆ خوا دانەر ئەگەر یەکێکیان موسوڵمان بێ

٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الزَّوْجَيْنِ الْمُشْرِكَيْنِ يُسْلِمُ أَحَدُهُمَا

١١٤٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الْحَجَّاجِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَدَّ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بِمَهْرٍ جَدِيدٍ وَنِكَاحٍ جَدِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ فِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ، وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا أَسْلَمَتْ قَبْلَ زَوْجِهَا ثُمَّ أَسْلَمَ زَوْجُهَا وَهِيَ فِي الْعِدَّةِ أَنَّ زَوْجَهَا أَحَقُّ بِهَا مَا كَانَتْ فِي الْعِدَّةِ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالأَوْزَاعِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زەینەبی کچی دایەوە بە

ئەبو عاصی كوڕی رەبیع بە مارەیی تازەو مارەبڕینێكی تازەوە.

بە پەیڕەوكردنی فەرموودەكە لای هەندێ لە زانایان ئەگەر ئافرەتێ لەپێش مێردەكەیەوە موسوڵمان ببێ، لەپاشدا مێردەكەشی موسوڵمان ببێ، لە عیدەی شەرعیدا بوو ئەوە مێردەكەی لەپێشترە بۆی مادەم لە عیدەدا بێ، ئەمەش وتەی پێشەوایان مالیك و ئەوزاعی و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

١١٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنِي دَاوُدُ بْنُ الْحُصَيْنِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: رَدَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بَعْدَ سِتِّ سِنِينَ بِالنِّكَاحِ الأَوَّلِ، وَلَمْ يُحْدِثْ نِكَاحًا. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ بِإِسْنَادِهِ بَأْسٌ، وَلَكِنْ لاَ نَعْرِفُ وَجْهَ هَذَا الْحَدِيثِ، وَلَعَلَّهُ قَدْ جَاءَ هَذَا مِنْ قِبَلِ دَاوُدَ بْنِ حُصَيْنٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپاش شەش ساڵ زەینەبی كچی دایەوە بە ئەبو عاصی كوڕی رەبیع بە مارەیی یەكەم جار واتە بەمارەیی پێشو، هیچ شتێكی تازە پەیدا نەبوو.

١١٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ مُسْلِمًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ جَاءَتِ امْرَأَتُهُ مُسْلِمَةً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا كَانَتْ أَسْلَمَتْ مَعِي فَرُدَّهَا عَلَيَّ فَرَدَّهَا عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پیاوێ هات موسوڵمان بوو، لەپاشدا هاوسەرەكەشی هات موسوڵمان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم ژنەكەشم لەگەڵ من موسوڵمان بووە، بۆم بگێڕەوە، ئەویش بۆی گێڕایەوە.

(ضعيف) سَمِعْتُ عَبْدَ بْنَ حُمَيْدٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ يَزِيدَ بْنَ هَارُونَ يَذْكُرُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ هَذَا الحَدِيثَ. وَحَدِيثُ الحَجَّاجِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَدَّ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بِمَهْرٍ جَدِيدٍ، وَنِكَاحٍ جَدِيدٍ. قَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ: حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ أَجْوَدُ إِسْنَادًا. وَالعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەینەبی كچی دایەوە بە ئەبو عاص بە مارەیی تازەو مارەبڕینێكی تازەوە.

### پیاوێ ئافرەتێ مارە بكات بێ ئەوەی مارەیی بۆ دیاری بكات بمرێ

### ٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ فَيَمُوتُ عَنْهَا قَبْلَ أَنْ يَفْرِضَ لَهَا

١١٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الحُبَابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا، لاَ وَكْسَ، وَلاَ شَطَطَ، وَعَلَيْهَا العِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الأَشْجَعِيُّ، فَقَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ امْرَأَةٍ مِنَّا مِثْلَ الَّذِي قَضَيْتَ، فَفَرِحَ بِهَا ابْنُ مَسْعُودٍ. وَفِي البَاب عَنِ الجَرَّاحِ.

واتە: سەبارەت بە ئافرەتێ كە پیاوێ مارەی بكات، لەپاشدا بمرێت، بەبێ ئەوەی مارەیی بۆ دیاری بكات، پێش ئەوەی بچێتە لای، لە ئیبنو مەسعودیان ڕەزای خوای لێ بێ پرسی وتی: من وادەبینم كە مارەیی ئافرەتانی وەك خۆی بۆ هەیە

بەبێ کەم و زیاد، عیددەشی لەسەرەو، میراتیشی بۆ هەیە، جا مەعقەلی کوڕی سینان هەستا فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەر بەم شێوەیە بڕیای دا لەبارەی بیروەعی کچی واشیقەوە، ئیتر ئیبنو مەسعود زۆر دڵی خۆش بوو.

١١٤٥(م) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ كِلاَهُمَا، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ نَحْوَهُ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، وَبِهِ يَقُولُ الثَّوْرِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، وَابْنُ عُمَرَ، إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا حَتَّى مَاتَ قَالُوا: لَهَا الْمِيرَاثُ، وَلاَ صَدَاقَ لَهَا، وَعَلَيْهَا العِدَّةُ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ قَالَ: لَوْ ثَبَتَ حَدِيثُ بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ لَكَانَتِ الحُجَّةُ فِيمَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرُوِي عَنِ الشَّافِعِيِّ، أَنَّهُ رَجَعَ بِمِصْرَ بَعْدُ عَنْ هَذَا القَوْلِ، وَقَالَ بِحَدِيثِ بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ.

# باسەکانی شیرخواردن لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ١٠ - أَبْوَابُ الرَّضَاعِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### باسی ئەو ئافرەتانەی بەهۆی خزمایەتیەوە خوای گەورە حەرامی کردوون بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبن

١ - بَابُ مَا جَاءَ يُحَرَّمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يُحَرَّمُ مِنَ النَّسَبِ

١١٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَا حَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ. وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ. حَدِيثُ عَلِيٍّ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو ئافرەتانەی بەهۆی خزمایەتیەوە خوای گەورە حەرامی کردوون بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبن).

١١٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا حَرَّمَ مِنَ الوِلاَدَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ فِي ذَلِكَ اخْتِلاَفًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو ئافرەتانەی بەهۆی لەدایك بوونەوە خوای گەورە حەرامی کردوون، بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبن).

### مێردی ئافرەتە شیردەرەکە دەبێتە باوکی شیری

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لَبَنِ الفَحْلِ

١١٤٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَ عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، حَتَّى أَسْتَأْمِرَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، قَالَتْ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، قَالَ: فَإِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: كَرِهُوا لَبَنَ الفَحْلِ، وَالأَصْلُ فِي هَذَا حَدِيثُ عَائِشَةَ، وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي لَبَنِ الفَحْلِ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مامێکی شیریم هات بۆ سەردانم داوای کرد مۆڵەتی پێ بدەم بێتەژوورەوە بۆ لام، منیش مۆڵەتم پێ نەدا هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ نەکردم، فەرمووی: (رێگەی بدە با بێتەژوورەوە بێگومان ئەوە مامی تۆیە). عائیشە فەرمووی: بێگومان ژن شیری پێ داوم خۆ شیری پیاوم نەخواردوە، فەرمووی: (رێگەی بدە با بێتەژوورەوە بێگومان ئەوە مامی تۆیە).

١١٤٩ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ لَهُ جَارِيَتَانِ أَرْضَعَتْ إِحْدَاهُمَا جَارِيَةً، وَالأُخْرَى غُلاَمًا، أَيَحِلُّ لِلْغُلاَمِ أَنْ يَتَزَوَّجَ بِالجَارِيَةِ؟ فَقَالَ: لاَ، اللِّقَاحُ وَاحِدٌ: وَهَذَا تَفْسِيرُ لَبَنِ الفَحْلِ. وَهَذَا الأَصْلُ فِي هَذَا البَابِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پرسیاریان لێ کرد دەربارەی پیاوێ دوو کەنیزەکی هەبێ: یەکێکیان شیربدات بە جاریەیە ئەوی تریشیان شیربدات بە غولامێ، ئایا ئەو غولامە بۆی حەلاڵە ئەو جاریە مارەبکات؟ فەرمووی: نەخێر، یەکی لیقاحن.

## دەربارەی مژێك و دوو مژ ئافرەت حەرام ناكات

## ٣ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ

١١٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَيُّوبَ يُحَدِّثُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ الفَضْلِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ، وَابْنِ الزُّبَيْرِ. وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ. وَرَوَى مُحَمَّدُ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَزَادَ فِيهِ مُحَمَّدُ بْنُ دِينَارٍ البَصْرِيُّ، عَنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَالصَّحِيحُ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ حَدِيثُ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ،

عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا، فَقَالَ: الصَّحِيحُ عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ، وَحَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ دِينَارٍ وَزَادَ فِيهِ، عَنِ الزُّبَيْرِ، وَإِنَّمَا هُوَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الزُّبَيْرِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: أُنْزِلَ فِي القُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ، فَنُسِخَ مِنْ ذَلِكَ خَمْسٌ، وَصَارَ إِلَى خَمْسِ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مژێك و دوو مژ شیرخواردن ئافرەت حەرام ناکات).

لە (عبد الله)ی کوڕی زوبێرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مژێك و دوو مژ شیرخواردن ئافرەت حەرام ناکات).

عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: لەپێشدا ئەم ئایەتە دابەزی: (عَشْرُ رَضَعَاتٍ يُحَرِّمْنَ). واتە: دە ژەم شیرخواردنی دیاریکراو، ئافرەت و پیاو لەیەك حەرام دەکەن. لەپاشدا ئەم دە ژەمە هەڵوەشایەوە و بوو بە پێنج ژەم: (خَمْس مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ). واتە: پێنج ژەم شیرخواردنی دیاریکراو، ئافرەت و پیاو لەیەك حەرام دەکەن. لەدوایدا ئەمەش نەسخ بوەوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد هەندێ کەس هەر بە قورئانیان دەزانی و دەیانخوێندەوە.

١١٥٠ م- (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ بِهَذَا، وَبِهَذَا كَانَتْ عَائِشَةُ تُفْتِي وَبَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ،

وَإِسْحَاقَ. وقَالَ أَحْمَدُ بِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ، وقَالَ: إِنْ ذَهَبَ ذَاهِبٌ إِلَى قَوْلِ عَائِشَةَ فِي خَمْسِ رَضَعَاتٍ فَهُوَ مَذْهَبٌ قَوِيٌّ وَجَبُنَ عَنْهُ أَنْ يَقُولَ فِيهِ شَيْئًا. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: يُحَرِّمُ قَلِيلُ الرَّضَاعِ وَكَثِيرُهُ إِذَا وَصَلَ إِلَى الجَوْفِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالأَوْزَاعِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَوَكِيعٍ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ هُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ وَيُكْنَى أَبَا مُحَمَّدٍ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ قَدْ اسْتَقْضَاهُ عَلَى الطَّائِفِ. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: أَدْرَكْتُ ثَلاَثِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموون: زۆر بێ کەم بێ مادەم بگاتە ناوسکی شیرەخۆرەکەوە ئافرەت و پیاو لەیەك حەرام دەکەن، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و مالیك و (عبد الله)ی کوڕی موبارەك و وەکیع و خەڵکی کوفەیە.

## شایەتی یەك ئافرەت لەبارەی شیرخواردنەوە

## ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَهَادَةِ الْمَرْأَةِ الوَاحِدَةِ فِي الرَّضَاعِ

١١٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ قَالَ: وَسَمِعْتُهُ مِنْ عُقْبَةَ وَلَكِنِّي لِحَدِيثِ عُبَيْدٍ أَحْفَظُ، قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ فُلاَنَةَ بِنْتَ فُلاَنٍ، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، وَهِيَ كَاذِبَةٌ، قَالَ: فَأَعْرَضَ عَنِّي، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، فَأَعْرَضَ عَنِّي بِوَجْهِهِ،

فَقُلْتُ: إِنَّهَا كَاذِبَةٌ، قَالَ: وَكَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا، دَعْهَا عَنْكَ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ دَعْهَا عَنْكَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَجَازُوا شَهَادَةَ الْمَرْأَةِ الوَاحِدَةِ فِي الرَّضَاعِ. وقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تَجُوزُ شَهَادَةُ امْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ فِي الرَّضَاعِ وَيُؤْخَذُ يَمِينُهَا، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ الوَاحِدَةِ حَتَّى يَكُونَ أَكْثَرَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ. سَمِعْتُ الجَارُودَ يَقُولُ: سَمِعْتُ وَكِيعًا يَقُولُ: لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ امْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ فِي الحُكْمِ وَيُفَارِقُهَا فِي الوَرَعِ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی (حارث)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئافرەتێکم مارەکرد، ژنێکی ڕەشتاڵە هاتەژوورەوە بۆلامان، وتی: شیرم داوە بە هەردوکتان، منیش چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وتم: ئافرەتێکم مارەکردووە، ژنێکی ڕەشتاڵە هاتوە دەڵێ: شیرم داوە بە هەردوکتان، بەڵام درۆ دەکات، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پشتی تێ کردم، وتی: بەرەو ووڕووی ڕۆشتم، ڕووی لێ وەرگێڕام، وتم: ئەوە درۆ دەکات، فەرمووی: (بەچی دا ئەزانی ئەوەی ئەو ئافرەتە دەیڵێ ڕاستە یان نا، بۆیە واز لەو ژنە بێنە لەبەرئەوەی ئەو ئافرەتە ڕەشتاڵە شایەتی دەدا کە شیری پێ داون).

## شیرخواردن حەرام ناکات مەگەر تەمەنی منداڵ لە دوو ساڵ کەمتر بێ

### ٥ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الرَّضَاعَةَ لاَ تُحَرِّمُ إِلاَّ فِي الصِّغَرِ دُونَ الحَوْلَيْنِ

**١١٥٢ - (صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُحَرِّمُ مِنَ الرِّضَاعَةِ إِلاَّ مَا فَتَقَ الأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ، وَكَانَ قَبْلَ الفِطَامِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الرَّضَاعَةَ لاَ تُحَرِّمُ إِلاَّ مَا كَانَ دُونَ الحَوْلَيْنِ، وَمَا كَانَ بَعْدَ الحَوْلَيْنِ الكَامِلَيْنِ فَإِنَّهُ لاَ يُحَرِّمُ شَيْئًا. وَفَاطِمَةُ بِنْتُ الْمُنْذِرِ بْنِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ وَهِيَ امْرَأَةُ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (شیرخواردن حەرام ناکات هەتا لەمەمکەوە نەگاتە گەدە، ئەمەش پێش ئەوەی لەشیر ببڕێتەوە).

## چی حەقی شیردەری منداڵ لەسەر ناهێڵێت

### ٦ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُذْهِبُ مَذَمَّةَ الرَّضَاعِ

**١١٥٣ - (ضعيف)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ حَجَّاجٍ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يُذْهِبُ عَنِّي مَذَمَّةَ الرَّضَاعِ؟ فَقَالَ: غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ: مَا يُذْهِبُ عَنِّي مَذَمَّةَ الرَّضَاعِ، يَقُولُ: إِنَّمَا يَعْنِي بِهِ ذِمَامَ الرَّضَاعَةِ وَحَقَّهَا، يَقُولُ: إِذَا أَعْطَيْتَ الْمُرْضِعَةَ عَبْدًا أَوْ أَمَةً فَقَدْ قَضَيْتَ ذِمَامَهَا. وَيُرْوَى عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ أَقْبَلَتْ امْرَأَةٌ، فَبَسَطَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِدَاءَهُ حَتَّى قَعَدَتْ عَلَيْهِ، فَلَمَّا

ذَهَبَتْ قِيلَ: هِيَ كَانَتْ أَرْضَعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَكَذَا رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، وَحَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ حَجَّاجٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَى سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ أَبِي حَجَّاجٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَحَدِيثُ ابْنِ عُيَيْنَةَ غَيْرُ مَحْفُوظٍ. وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى هَؤُلَاءِ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ. وَهِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ يُكْنَى أَبَا الْمُنْذِرِ، وَقَدْ أَدْرَكَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، وَابْنَ عُمَرَ

واتە: لە حەجاجی ئەسلەمیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، چ شتێ حەقی شیردەری منداڵەکەم لەسەر ناهێڵێت هەتا جێبەجێی بکەم بەتەواوی؟ فەرمووی: (پێشکەشکردنی بەندەیەك ئیتر نێر بێت یان مێ).

لە ئەبو (طفیل)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم دانیشتبووم، ئافرەتێ هاتە خزمەتی، پۆشاکەکەی بەری خۆی بۆ راخست بۆ ئەوەی لەسەری دانیشێ، کاتێ کە رۆشت، وتیان: ئەم ئافرەتە شیری داوە بە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم.

## دەربارەی کەنیزەکێ ئازاد بکرێت و هاوسەری هەبێ

## ٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ تُعْتَقُ وَلَهَا زَوْجٌ

١١٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ عَبْدًا فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا، وَلَوْ كَانَ حُرًّا لَمْ يُخَيِّرْهَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ بەریرە ئازاد کرا هاوسەرەکەی بەندە بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم

بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد: كە یا وەك جاران بەلای مێردەكەیەوە دانیشێ، یان هەر لە ئێستاوە دەستی لێ هەڵگرێ، ئەویش لە مێردەكەی جیابویەوە، ئەگەر مێردەكەی بەریرە ئازاد بوایە ئەوا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەریرەی سەرپشك نەدەكرد.

١١٥٥ - (شاذ، بلفظ (حرا)، والمحفوظ: (عبدا) ) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ حُرًّا، فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. هَكَذَا رَوَى هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ عَبْدًا، وَرَوَى عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: رَأَيْتُ زَوْجَ بَرِيرَةَ وَكَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ وَقَالُوا: إِذَا كَانَتِ الأَمَةُ تَحْتَ الحُرِّ فَأُعْتِقَتْ فَلاَ خِيَارَ لَهَا، وَإِنَّمَا يَكُونُ لَهَا الخِيَارُ إِذَا أُعْتِقَتْ وَكَانَتْ تَحْتَ عَبْدٍ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَرَوَى الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ حُرًّا، فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَى أَبُو عَوَانَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، فِي قِصَّةِ بَرِيرَةَ، قَالَ الأَسْوَدُ: وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ بەریرە ئازاد كرا هاوسەرەكەی ئازاد بوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد. هەر لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ بەریرە ئازاد كرا هاوسەرەكەی بەندە بوو. لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هاوسەرەكەی بەریرەم دی، بەندەیە بوو بە ناوی (مُغیث).

١١٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، وَقَتَادَةُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا أَسْوَدَ لِبَنِي الْمُغِيرَةِ يَوْمَ أُعْتِقَتْ بَرِيرَةُ، وَاللهِ لَكَأَنِّي بِهِ فِي طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَنَوَاحِيهَا، وَإِنَّ دُمُوعَهُ لَتَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ يَتَرَضَّاهَا لِتَخْتَارَهُ فَلَمْ تَفْعَلْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَسَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ هُوَ سَعِيدُ بْنُ مِهْرَانَ، وَيُكْنَى أَبَا النَّضْرِ.

لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ بەریرە ئازاد کرا هاوسەرەکەی بەندەیەکی رەش بوو لە هۆزی موغیرە، سوێند بە (الله) وەك ئەوەی ئێستا بە چاوی خۆم ببینم لە رێگای مەدینەو دەوروبەری لەدوایەوە دەڕۆیشت و فرمێسکەکانی بە سەر ریشیدا دەهاتنەخوارەوە و داوای دەکرد بەریرە ئەو هەڵبژێرێ، بەڵام بەریرە رازی نەبوو.

### دەربارەی منداڵ هی خاوەن نوێنە

٨ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوَلَدَ لِلْفِرَاشِ

١١٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَعُثْمَانَ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَعَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَالبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، وَزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (منداڵ هی خاوەن نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ شەرواڵ پیس دەمێنێتەوە).

## دەربارەی پیاوێ ئافرەتێکی دی پێی موعجیب بوو

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَرَى الْمَرْأَةَ تُعْجِبُهُ

١١٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى امْرَأَةً، فَدَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ، فَقَضَى حَاجَتَهُ، وَخَرَجَ، وَقَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا أَقْبَلَتْ أَقْبَلَتْ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ امْرَأَةً فَأَعْجَبَتْهُ، فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ فَإِنَّ مَعَهَا مِثْلَ الَّذِي مَعَهَا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَهِشَامُ بْنُ أَبِي عَبْدِ اللهِ هُوَ صَاحِبُ الدَّسْتُوَائِيُّ هُوَ هِشَامُ بْنُ سَنْبَرٍ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە جارێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئافرەتێکی بینی، چوو بۆ لای زەینەبی کچی جەحش پێویستی خۆی جێبەجێ کرد، لەپاشدا هاتەوە بۆ ناو هاوەڵانی و پێی فەرموون: (بێگومان ژن لەشێوەی شەیتاندا دێت، جا ئەگەر یەکێکتان ژنێکی ئاوای دی و ئارەزووی جوڵا با بچێتە لای ژنەکەی خۆی چونکە ئەوەی ئەو هەیەتی ئەویش هەیەتی بەو شێوەیە ئارەزووی کەم دەکاتەوە).

## دەربارەی مافی مێرد بەسەر ژنەکەیەوە

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ الزَّوْجِ عَلَى الْمَرْأَةِ

١١٥٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا. وَفِي البَاب عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَسُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ

اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، وَطَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر فەرمانم بكردایە بە كەسێ سەجدە بەرێ بۆ كەسێكی تر، ئەوا فەرمانم دەكرد بە ئافرەت سەجدە بەرێ بۆ مێردەكەی ئەوەندەی مافی هەیە بەسەریەوە). بەڵام سەجدەبردن بۆ غەیری (الله) بەهیچ شێوەیە دروست نیە.

١١٦٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُلاَزِمُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بَدْرٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، عَنْ أَبِيهِ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ، وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (طلق)ی كوڕی عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر پیاو ژنەكەی خۆی بانگ كرد بۆ كاری سەرجێیی با بچێت بەدەمیەوە ئەگەر لەسەر تەنوریش بێ و نان بكات، كارەكەی بەجێ بهێڵێ و بڕوات بۆ لای).

١١٦١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَبِي نَصْرٍ، عَنْ مُسَاوِرٍ الحِمْيَرِيِّ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَنْهَا رَاضٍ دَخَلَتِ الجَنَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەر ئافرەتێ بمرێت و مێردەكەی لێی رازی بێ دەچێتە بەهەشتەوە).

### دەربارەی مافی ئافرەت بەسەر مێردەكەیەوە

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ عَلَى زَوْجِهَا

١١٦٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِنِسَائِهِمْ. وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەو موسوڵمانانەی كە بە تەواوی باوەڕیان هەیە ئەوانەن كە ئاكار و رەوشتیان جوانە، وە چاكترینتان چاكترینە بۆ هاوسەرەكەی).

١١٦٣ - (حسن) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ غَرْقَدَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَّرَ، وَوَعَظَ، فَذَكَرَ فِي الحَدِيثِ قِصَّةً، فَقَالَ: أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً، أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ

لِمَنْ تَكْرَهُونَ، أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: عَوَانٌ عِنْدَكُمْ، يَعْنِي: أَسْرَى فِي أَيْدِيكُمْ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باوکم بۆ باسکردم کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئامادەی حەجی مالآوایی بووە، سوپاس و ستایشی خوای کردوو، یادی خوای کردوو ئامۆژگاری خەڵکەکەی کرد، فەرمووی: (هۆشیاربن ئامۆژگاری یەکتری بکەن بە باشی دەربارەی ئافرەتان، چونکە ئەوان لەژێر دەستی ئێوەدان، جگە لەوە ئێوە هیچ دەسەڵاتێکی ترتان بەسەر ئەوانەوە نیە، لە قسەی ناشیرین و نەشیاو، مەگەر کارێکی خراپ و تاوانێکی ئاشکرایان لێ دەربکەوێت، ئەگەر کارێکی لەو شێوەیان کرد جێگەی نوستنیان لێ جیابکەنەوە، لێیان بدەن بە لێدانێکی سوك و پەروەردە ئامێز برینداریان مەکەن، ئەگەر فەرمانبەردار و گوێڕایەڵ بوون ئیتر زۆر زەختیان لێ مەکەن و مەیانچەوسێننەوە، ئاگاداربن ئێوە مافتان هەیە بەسەر ژنەکانتانەوە، ئەوانیش مافیان هەیە بەسەر ئێوەوە، مافی ئێوە بەسەر ژنەکانتانەوە ئەمەیە نەیەڵن کەسێ خۆشتان ناوێ بێتە ماڵتانەوە، مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەمەیە مامەڵەی چاك و جوانیان لەگەڵ بکەن خواردن و پۆشاك و شوێنی حەوانەوە و مەسکەنیان بۆ ئامادە بکەن).

## دەبارەی لەدواوە چوونە لای ژن دروست نیە

١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ إِتْيَانِ النِّسَاءِ فِي أَدْبَارِهِنَّ

١١٦٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عِيسَى بْنِ حِطَّانَ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ سَلاَّمٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ قَالَ:

أَتَى أَعْرَابِيٌّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، الرَّجُلُ مِنَّا يَكُونُ فِي الفَلاَةِ فَتَكُونُ مِنْهُ الرُّوَيْحَةُ، وَيَكُونُ فِي الْمَاءِ قِلَّةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ، وَلاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الحَقِّ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَخُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ. وسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: لاَ أَعْرِفُ لِعَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ الوَاحِدِ، وَلاَ أَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ حَدِيثِ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ السُّحَيْمِيِّ. وَكَأَنَّهُ رَأَى أَنَّ هَذَا رَجُلٌ آخَرُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: عەلی کوڕی (طلق)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! کەسێ لە ئێمە لەدەشتێکی فروان و چۆڵ و بێ ئاودا بایەکی لێ بووەوە و ئاوی کەمی پێ بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئەگەر کەسێ لە ئێوە بایەکی لێ بووەوە با دەستنوێژ بگرێتەوە، لەدواوە مەچنە لای ژنەکانتان - مەبەست لە کۆمە - ، بێگومان خوای گەورە شەرم ناکات لە هەق).

١١٦٥ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلاً أَوْ امْرَأَةً فِي الدُّبُرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى وَكِيعٌ هَذَا الْحَدِيثَ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بە سۆز و بەزەییەوە سەیری کەسێ ناکات لەدواوە بچێتە لای ژنێ یان پیاوێ).

١١٦٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مُسْلِمٍ وَهُوَ ابْنُ سَلاَّمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ، وَلاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ. وَعَلِيٌّ هَذَا هُوَ عَلِيُّ بْنُ طَلْقٍ.

واتە: عەلییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە بایەکی لێ بووەوە با دەستنوێژ بگرێتەوە، لەدواوە مەچنە لای ژنەکانتان).

## ئافرەتان خۆیان جوان بکەن و بچنەدەرەوە کارێکی خراپە

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الزِّينَةِ

١١٦٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ سَعْدٍ، وَكَانَتْ خَادِمًا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَثَلُ الرَّافِلَةِ فِي الزِّينَةِ فِي غَيْرِ أَهْلِهَا كَمَثَلِ ظُلْمَةِ يَوْمِ القِيَامَةِ لاَ نُورَ لَهَا. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، وَمُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ، وَهُوَ صَدُوقٌ. وَقَدْ رَوَى عَنْهُ شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە مەیمونەی کچی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ کە خزمەتکاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وێنەی ئەو ئافرەتەی خۆی دەرازێنێتەوە بۆ جگە لە مەحرەم لەڕۆژی قیامەتدا وەك روناکیە وایە شەوقی نەبێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی غیرەت

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغَيْرَةِ

١١٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنِ الحَجَّاجِ الصَّوَّافِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وَالمؤْمِنُ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الحَدِيثُ. وَكِلاَ الحَدِيثَيْنِ صَحِيحٌ. وَالحَجَّاجُ الصَّوَّافُ هُوَ الحَجَّاجُ بْنُ أَبِي عُثْمَانَ، وَأَبُو عُثْمَانَ: اسْمُهُ مَيْسَرَةُ، وَالحَجَّاجُ يُكْنَى أَبَا الصَّلْتِ وَثَّقَهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ العَطَّارُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمَدِينِيِّ قَالَ: سَأَلْتَ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ القَطَّانَ عَنْ حَجَّاجٍ الصَّوَّافِ؟ فَقَالَ: ثِقَةٌ، فَطِنٌ كَيِّسٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صـلى الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (خـوای گـەورە بـە غیرەتـە، باوەڕدار غیرەت دەیگرێ لەسەر پاراستنی شەرەف و ناموسی خۆی، خوای گەورەش غیرەت دەیگـرێ لەکاتێکدا کـە شـتێکی حـەرام کـردووە و کەسـێ بچـێ ئـەنجامی بدات).

## بۆ هیچ ئافرەتێ ڕەوا نیە بە تەنیا بڕوات بۆ سەفەر

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ تُسَافِرَ الْمَرْأَةُ وَحْدَهَا

١١٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا يَكُونُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا إِلاَّ وَمَعَهَا

أَبُوهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ زَوْجُهَا، أَوْ ابْنُهَا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرُوِي عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لاَ تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَكْرَهُونَ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تُسَافِرَ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الْمَرْأَةِ إِذَا كَانَتْ مُوسِرَةً وَلَمْ يَكُنْ لَهَا مَحْرَمٌ، هَلْ تَحُجُّ؟ فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ يَجِبُ عَلَيْهَا الحَجُّ لأَنَّ الْمَحْرَمَ مِنْ السَّبِيلِ لِقَوْلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ: (مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً)، فَقَالُوا: إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا مَحْرَمٌ فَلاَ تَسْتَطِيعُ إِلَيْهِ سَبِيلاً، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا كَانَ الطَّرِيقُ آمِنًا فَإِنَّهَا تَخْرُجُ مَعَ النَّاسِ فِي الحَجِّ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێ کە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێت رەوا نیە ماوەی سێ رۆژ یان زیاتر بڕوات بۆ سەفەر مەگەر باوکی یان براکەی یان مێردەکەی یان کوڕەکەی یا مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێ). لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێ رەوا نیە ماوەی شەو و رۆژێ بڕوات بۆ سەفەر مەگەر مەحرەمێکی خۆی لەگەڵ بێ).

زانایان رایان جیاوازە دەربارەی ئافرەتێ توانا و دەسەڵاتی رۆیشتنی حەجی هەبێ و کاری بۆ ئاسان بێ بەڵام مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا نەبێت، ئایا بۆی هەیە حەج بکات؟ هەندێ لە زانایان دەفەرموون: حەجی لەسەر واجب نیە، لەبەرئەوەی مەحرەم ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە: (مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً). واتە: بۆ کەسێ توانای رۆیشتنی هەبێ. دەفەرموون: ئەگەر مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا نەبێت ئەوە بۆی نیە بڕوات، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (پوری) و خەڵکی کوفەیە. هەندێ لە

زانایانی تر دەفەرموون: ئەگەر رێگە ئاسایش و ئارام بێ بێگومـان لەگـەڵ خەڵکـدا بۆی هەیە بڕوات بۆ حەج، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و مالیکە.

١١٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُسَافِرُ امْرَأَةٌ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (بـۆ هـیچ ئـافرەتێ رەوا نیـە ماوەی شەو و رۆژێ بڕوات بۆ سەفەر مەگەر مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێت).

## دەربارەی نارەوایی چونە خەڵوەت لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الدُّخُولِ عَلَى الْمُغِيبَاتِ

١١٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ، قَالَ: الحَمْوُ الْمَوْتُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَعَمْرِو بْنِ العَاصِ. حَدِيثُ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِنَّمَا مَعْنَى كَرَاهِيَةِ الدُّخُولِ عَلَى النِّسَاءِ عَلَى نَحْوِ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ: الحَمْوُ، يُقَالُ: هُوَ أَخُو الزَّوْجِ، كَأَنَّهُ كَرِهَ لَهُ أَنْ يَخْلُوَ بِهَا.

واتـە: لـە عوقبـەی کـوڕی عـامیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆتـان بپـارێزن لە چونە خەڵوەت لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا، پیاوێکی ئەنصـاری فـەرمووی: ئـەی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا بۆ خزمی مێرد وەك برای و برازای و مامی و ئامۆزاشی حەرامە خەڵوەت لەگەڵ خێزانیدا بکەن؟ فەرمووی: (خزمی مێرد مردنە، ئەوە لە هەمووی خراپترە). لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هیچ ئافرەت و پیاوێ کۆنابنەوە ئیللا شەیتان سێیەمیانە).

## باسێکی تر لەوبارەوە

١٧ - بَابٌ

١١٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَلِجُوا عَلَى الْمُغِيبَاتِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنْ أَحَدِكُمْ مَجْرَى الدَّمِ، قُلْنَا: وَمِنْكَ؟ قَالَ: وَمِنِّي، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُهُمْ فِي مُجَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ، وسَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ خَشْرَمٍ يَقُولُ: قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ فِي تَفْسِيرِ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمُ، يَعْنِي: أَسْلَمُ أَنَا مِنْهُ. قَالَ سُفْيَانُ: وَالشَّيْطَانُ لاَ يُسْلِمُ. وَلاَ تَلِجُوا عَلَى الْمُغِيبَاتِ، وَالمغِيبَةُ: الْمَرْأَةُ الَّتِي يَكُونُ زَوْجُهَا غَائِبًا، وَالمغِيبَاتُ: جَمَاعَةُ الْمُغِيبَةِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆتان بپارێزن لە چوونە خەڵوەت لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا، چونکە شەیتان لەناو جەستەی هەر یەکێ لە ئێوەدا وەك خوێن هاتوچۆ دەکات، وتمان: تەنانەت جەستەی تۆیش؟ فەرمووی: (منیش، بەڵام خوای گەورە یارمەتی داوم من پارێزراوم لێی).

## باسێكی تر لەوبارەوە

١٨ - بَابٌ

١١٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُوَرِّقٍ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ، فَإِذَا خَرَجَتْ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەت هەموو جەستەی شەرمگەیە، كاتێ كە لەماڵ دەرچوو شەیتان لەبەر چاوی پیاوان جوانی دەكات و دەیڕازێنێتەوە بۆ ئەوەی فریویان بدات).

## باسێكی تر لەوبارەوە

١٩ - بَابٌ

١١٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ بَحِيرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ الحَضْرَمِيِّ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا، إِلاَّ قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الحُورِ العِينِ: لاَ تُؤْذِيهِ، قَاتَلَكِ اللَّهُ، فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكَ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَرِوَايَةُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ عَنِ الشَّامِيِّينَ أَصْلَحُ، وَلَهُ عَنْ أَهْلِ الحِجَازِ وَأَهْلِ العِرَاقِ مَنَاكِيرُ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر ژنێ لەدنیادا ئازاری

مێردەکەی بدات، ژنەکەی تری کە حۆری بەهەشتە دەڵێ: خوا بتکوژێ ئازاری مەدە، ئەوە لای تۆ میوانە تۆ بەجێدێڵێ و دێت بۆ لای ئێمە).

# باسەكانی تەلاق و شەڕەنەفرین لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ١١ - أَبْوَابُ الطَّلَاقِ وَاللِّعَانِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی تەلاقی سوننەت

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طَلَاقِ السُّنَّةِ

١١٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ: هَلْ تَعْرِفُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، فَإِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا. قَالَ: قُلْتُ: فَيُعْتَدُّ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ؟ قَالَ: فَمَهْ أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ.

واتە: یونوسی كوڕی جوبەیر دەڵێت: لە (عبدالله)ی كوڕی عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی: وتم: پیاوێ ژنەكەی تەلاق دەدات لەكاتێكدا كە ژنەكەی لە حاڵەتی بێ نوێژیدایە حوكمی چی یە؟ وتی: (عبدالله)ی كوڕی عومەر دەناسی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: بێگومان (عبدالله)ی كوڕی عومەر ژنەكەی تەلاق دا لەكاتێكدا كە لەحەیزدا بوو، عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەبارەی حوكمی ئەو تەلاقەوە لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ كرد بیگێڕێتەوە، یونوس فەرمووی: وتم: ئایا تەلاقەكەی حسابەو بە تەلاقێ دانرا لەسەرت؟ فەرمووی: ئەی چۆن دانانرێ بە تەلاقێ، هەر لەبەرئەوەی من خۆم ئەو هەڵەیەم كرد و نەمتوانی لەسەر شێوەی شەرعی ژنەكەم تەلاق بدەم و ئەو بێ ئەقڵیەم كرد، بەڵێ بەڵكو دانرا لەسەرم بە تەلاقێ.

١١٧٦ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، مَوْلَى آلِ طَلْحَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فِي الحَيْضِ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلاً. حَدِيثُ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَكَذَلِكَ حَدِيثُ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ طَلاَقَ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِرًا مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنْ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا وَهِيَ طَاهِرٌ فَإِنَّهُ يَكُونُ لِلسُّنَّةِ أَيْضًا. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ تَكُونُ ثَلاَثًا لِلسُّنَّةِ إِلاَّ أَنْ يُطَلِّقَهَا وَاحِدَةً وَاحِدَةً. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالُوا فِي طَلاَقِ الحَامِلِ: يُطَلِّقُهَا مَتَى شَاءَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُطَلِّقُهَا عِنْدَ كُلِّ شَهْرٍ تَطْلِيقَةً.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە، رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە ژنەکەی تەلاق دا لەحەیزدا بوو، جا عومەر رەزای خوای لێ بێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی حوکمی ئەو تەلاقەوە؟ ئەویش فەرمووی: (فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە، لەپاشدا کاتێ کە پاك بویەوە تەلاقی بدات، یان کە سکی پڕ بوو).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش تەلاقی سوننی ئەوەیە: لەکاتێکدا تەلاقی بدات کە پاك بووبێتەوەو لە سوڕی مانگانەدا نەبێ و کاری جووت بوونی لەگەڵ نەکردبێ، هەندێکی تریان دەفەرموون: لەکاتێکدا پاك بووبێتەوەو لە سوڕی مانگانەدا نەبێ سێ بە سێ تەلاقی بدات، هەروەها ئەمە تەلاقی سوننیە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەدە. هەندێکی تریان دەفەرموون: سێ بە

سێ تەڵاقی بدات، تەڵاقی سوننی نییە، مەگەر یەك تەڵاق یەك تەڵاق تەڵاقی بدات، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و ئیسحاقە، دەربارەی تەڵاقی ژنی سك پڕ دەفەرموون: کەی بیەوێ بۆی هەیە تەڵاقی بدات، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی تریان دەفەرموون: هەموو مانگێ یەك تەڵاقی بدات.

## دەربارەی پیاوێ ژنەکەی بە یەکجاری تەڵاق بدات

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ

١١٧٧ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي طَلَّقْتُ امْرَأَتِيَ الْبَتَّةَ، فَقَالَ: مَا أَرَدْتَ بِهَا؟ قُلْتُ: وَاحِدَةً، قَالَ: وَاللهِ؟ قُلْتُ: وَاللهِ، قَالَ: فَهُوَ مَا أَرَدْتَ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَقَالَ: فِيهِ اضْطِرَابٌ. وَيُرْوَى عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رُكَانَةَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي طَلاَقِ الْبَتَّةِ، فَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّهُ جَعَلَ الْبَتَّةَ وَاحِدَةً. وَرُوِيَ عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّهُ جَعَلَهَا ثَلاَثًا. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: فِيهِ نِيَّةُ الرَّجُلِ، إِنْ نَوَى وَاحِدَةً فَوَاحِدَةٌ، وَإِنْ نَوَى ثَلاَثًا فَثَلاَثٌ، وَإِنْ نَوَى ثِنْتَيْنِ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ وَاحِدَةً، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ. وَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ فِي الْبَتَّةِ: إِنْ كَانَ قَدْ دَخَلَ بِهَا فَهِيَ ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنْ نَوَى وَاحِدَةً فَوَاحِدَةٌ يَمْلِكُ الرَّجْعَةَ، وَإِنْ نَوَى ثِنْتَيْنِ فَثِنْتَانِ، وَإِنْ نَوَى ثَلاَثًا فَثَلاَثٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی یەزیدی کوڕی روکانەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ژنەكەم بە یەكجاری تەلاقدا، فەرمووی: (مەبەستت چی بوو؟) وتی: مەبەستم یەك تەلاق بوو، فەرمووی: (بڵێ: سوێند بە (الله) مەبەستم تەنیا یەك تەلاق بوو؟) روكانە وتی: سوێند بە (الله) مەبەستم تەنیا یەك تەلاق بوو، فەرمووی: (مەبەستت چی بووبێ هەر ئەوە حسابە؟).

لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە روكانە ژنەكەی سێ بە سێ تەلاق دا. زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش رایان جیاوازە دەربارەی تەلاقی سێ بە سێ بە یەكجاری، لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە سێ بە سێی بە یەك تەلاق داناوە، لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە سێ بە سێی بە سێ تەلاق داناوە. هەندێ لە زانایان دەفەرموون: بە پێی نیەت و مەبەستی پیاوەكەیە، ئەگەر نیەتی یەك تەلاق بێ ئەوە یەك تەلاقی دەكەوێت، خۆ ئەگەر نیەتی سێ بە سێ بێ ئەوە سێ بە سێ تەلاقی دەكەوێت، ئەگەر نیەتیشی دوو تەلاق بێ ئەوە یەك تەلاقی دەكەوێ، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و خەڵكی كوفەیە. پێشەوا مالیك دەفەرمووێ: ئەگەر چووبێتە لای ئەوە بە سێ تەلاق حیسابە، پێشەوا شافیعی دەفەرمووێ: ئەگەر نیەتی یەك تەلاق بێ ئەوە یەك تەلاقی دەكەوێت، دەتوانێ بیگێڕێتەوە ژێر ركێفی خۆی، ئەگەر نیەتی دوو تەلاق بێ ئەوە دوو تەلاقی دەكەوێت، ئەگەر نیەتیشی سێ بە سێ بێ ئەوە سێ بە سێ تەلاقی دەكەوێت.

## پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ: کاری خۆت بەدەستی خۆتە

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَمْرُكِ بِيَدِكِ

١١٧٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَيُّوبَ: هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ أَحَدًا قَالَ فِي أَمْرُكِ بِيَدِكِ إِنَّهَا ثَلاَثٌ إِلاَّ الحَسَنَ؟، فَقَالَ: لاَ، إِلاَّ الحَسَنَ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ غَفْرًا إِلاَّ مَا حَدَّثَنِي قَتَادَةُ عَنْ كَثِيرٍ، مَوْلَى بَنِي سَمُرَةَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ثَلاَثٌ. قَالَ أَيُّوبُ: فَلَقِيتُ كَثِيرًا مَوْلَى بَنِي سَمُرَةَ فَسَأَلْتُهُ: فَلَمْ يَعْرِفْهُ، فَرَجَعْتُ إِلَى قَتَادَةَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: نَسِيَ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ بْنِ حَرْبٍ عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَقَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ بِهَذَا، وَإِنَّمَا هُوَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مَوْقُوفٌ، وَلَمْ يَعْرِفْ مُحَمَّدٌ حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ مَرْفُوعًا. وَكَانَ عَلِيُّ بْنُ نَصْرٍ حَافِظًا صَاحِبَ حَدِيثٍ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي أَمْرُكِ بِيَدِكِ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ مِنْهُمْ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: هِيَ وَاحِدَةٌ، وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ. وقَالَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: القَضَاءُ مَا قَضَتْ. وقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِذَا جَعَلَ أَمْرَهَا بِيَدِهَا، وَطَلَّقَتْ نَفْسَهَا ثَلاَثًا، وَأَنْكَرَ الزَّوْجُ وَقَالَ: لَمْ أَجْعَلْ أَمْرَهَا بِيَدِهَا إِلاَّ فِي وَاحِدَةٍ اسْتُحْلِفَ الزَّوْجُ، وَكَانَ القَوْلُ قَوْلَهُ مَعَ يَمِينِهِ. وَذَهَبَ سُفْيَانُ وَأَهْلُ الكُوفَةِ إِلَى قَوْلِ عُمَرَ وَعَبْدِ اللهِ، وَأَمَّا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، فَقَالَ: القَضَاءُ مَا قَضَتْ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَأَمَّا إِسْحَاقُ فَذَهَبَ إِلَى قَوْلِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە حەمادی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە ئەیوبم وت: ئایا دەزانی جگە لە حەسەن کەسی تر (پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ کاری خۆت بەدەستی خۆتە)ی بە سێ بە سێ دانەناوە؟ فەرمووی:

نەخێر، جگە لە حەسەن، تەنیا ئەوە نەبێ کە قـەتادە بـۆی گێڕاینـەوە، لـە (کَثِیر)ی بەندەی رزگارکراوی کوڕی سـەمورەوە، لـە ئـەبو سـەلەمەوە، لـە ئـەبو هـورەیرەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسـلم کـە فەرموویـەتی: (سـێ تەڵاقـەیـە). ئەیوب وتی: گەیشتم بە راوی فەرمودەکە (کَثِیر) لەوبارەوە لێم پرسی؟ نەیزانی، بـۆ قەتادەم باس کرد، قەتادەش وتی: بەڵێ بۆی باس کردوم، بەڵام خۆی لەیادی چوە.

بێگومان زانایان رایان جیاوازە دەربارەی: پیـاوێ بـە ژنەکـەی بڵـێ کـاری خـۆت بەدەستی خۆتە، هەندێ لە زانایان لە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم و جگە لەوانیش وەك پێشەوا عومەر و (عبـد الله)ی کـوڕی مەسـعود رەزای خوایان لێ بێ دەفەرموون: بـە یـەك تـەڵاق دادەنرێـت، ئەمـەش وتـەی هەنـدێ لـە زانایانە لە شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش.

پێشەوا عوسمان و زەیدی کوڕی (ثابت) رەزای خوایان لێ بـێ دەفـەرموون: قسـە قسەی ژنەکەیە بڕیاری تەڵاق بە دەست ئەوە، ئیبنو عومـەر رەزای خوایـان لـێ بـێ دەربارەی پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ کاری خـۆت بەدەسـتی خۆتـە دەفـەرمووێ: ئەگـەر ژنەکە خۆی تەڵاق دا سێ بەسێ، هاوسـەرەکەی ئینکـاری بکـات و بڵـێ: مەبەسـتم یەك تەڵاق بووە، مێردەکە سوێند دەدرێت، قسە قسەی ئـەوە لەگـەڵ سـوێندەکەی، سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفە لەسەر وتەی پێشەوا عومەر و (عبد الله)ی کوڕی مەسعودن، بەڵام پێشەوا مالیك دەفەرمووێ: قسە قسەی ژنەکەیە بڕیاری تەڵاق بـە دەست ئەوە، ئەمەش وتەی پێشەوا ئەحمەدە، بەڵام پێشـەوا ئیسـحاق لەسـەر وتـەی ئیبنو عومەرە.

## سەبارەت بە سەرپشك کردن

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخِيَارِ

١١٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاخْتَرْنَاهُ، أَفَكَانَ طَلاَقًا؟ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ بِمِثْلِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الخِيَارِ، فَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُمَا قَالاَ: إِنْ اخْتَارَتْ نَفْسَهَا فَوَاحِدَةٌ بَائِنَةٌ. وَرُوِيَ عَنْهُمَا أَنَّهُمَا قَالاَ أَيْضًا: وَاحِدَةٌ يَمْلِكُ الرَّجْعَةَ، وَإِنْ اخْتَارَتْ زَوْجَهَا فَلاَ شَيْءَ. وَرُوِيَ عَنْ عَلِيٍّ أَنَّهُ قَالَ: إِنْ اخْتَارَتْ نَفْسَهَا فَوَاحِدَةٌ بَائِنَةٌ، وَإِنْ اخْتَارَتْ زَوْجَهَا فَوَاحِدَةٌ يَمْلِكُ الرَّجْعَةَ. وقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: إِنْ اخْتَارَتْ زَوْجَهَا فَوَاحِدَةٌ، وَإِنْ اخْتَارَتْ نَفْسَهَا فَثَلاَثٌ. وَذَهَبَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ، وَالفِقْهِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ فِي هَذَا البَابِ إِلَى قَوْلِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، وَأَمَّا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ فَذَهَبَ إِلَى قَوْلِ عَلِيٍّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەڵبژاردنی دایە دەست خۆمان ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، بە تەڵاق حساب نەکرا — واتە خۆمانی کرد بە سەرپشك کە یا بە ژنێتی ئەو رازی بین یان لێی جیاببینەوە، ئێمەش هاوسەرانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەر هەموومان ئەومان هەڵبژارد، ئیتر ئەوەی بە تەڵاق حساب نەکرد لەسەرمان - .

## ژنێ سێ بەسێ تەلاقی کەوتیێ و خەرجی و شوێنی حەوانەوەی نەبێ

## ٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُطَلَّقَةِ ثَلاَثًا لاَ سُكْنَى لَهَا وَلاَ نَفَقَةَ

١١٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلاَثًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ سُكْنَى لَكِ وَلاَ نَفَقَةَ. قَالَ مُغِيرَةُ: فَذَكَرْتُهُ لِإِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: قَالَ عُمَرُ: لاَ نَدَعُ كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّنَا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِقَوْلِ امْرَأَةٍ لاَ نَدْرِي أَحَفِظَتْ أَمْ نَسِيَتْ. وَكَانَ عُمَرُ يَجْعَلُ لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةَ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ قَالَ: أَنْبَأَنَا حُصَيْنٌ، وَإِسْمَاعِيلُ، وَمُجَالِدٌ، قَالَ هُشَيْمٌ: وَحَدَّثَنَا دَاوُدُ أَيْضًا، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، فَسَأَلْتُهَا عَنْ قَضَاءِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا، فَقَالَتْ: طَلَّقَهَا زَوْجُهَا الْبَتَّةَ، فَخَاصَمَتْهُ فِي السُّكْنَى وَالنَّفَقَةِ، فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً. وَفِي حَدِيثِ دَاوُدَ قَالَتْ: وَأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَدَّ فِي بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ، مِنْهُمُ الْحَسَنُ الْبَصْرِيُّ، وَعَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَالشَّعْبِيُّ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَقَالُوا: لَيْسَ لِلْمُطَلَّقَةِ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةٌ، إِذَا لَمْ يَمْلِكْ زَوْجُهَا الرَّجْعَةَ، وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِنْهُمْ عُمَرُ، وَعَبْدُ اللهِ: إِنَّ الْمُطَلَّقَةَ ثَلاَثًا لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: لَهَا السُّكْنَى وَلاَ نَفَقَةَ لَهَا، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَاللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، وَالشَّافِعِيِّ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا جَعَلْنَا لَهَا السُّكْنَى بِكِتَابِ اللهِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: (لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ). قَالُوا: هُوَ الْبَذَاءُ، أَنْ تَبْذُوَ عَلَى أَهْلِهَا، وَاعْتَلَّ بِأَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ لَمْ يَجْعَلْ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السُّكْنَى، لِمَا كَانَتْ تَبْذُو عَلَى أَهْلِهَا. قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَلاَ نَفَقَةَ لَهَا لِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قِصَّةِ حَدِيثِ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ.

واتە: لە (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی

پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم مێردەکەم سێ بەسێ تەڵاقی دام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (تۆ بژێوی و خەرجی و شوێنی حەوانەوەت لەسەر مێردەکەت نیە).

موغیرە فەرمووی: فەرموودەکەم باسکرد بۆ ئیبراهیم فەرمووی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: قورئان و سوننەت پشتگوێ ناخەین بۆ قسەی ئافرەتێ کە نازانین لەبەری کردووە یان لە یادی چووە، بۆیە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ خەرجی و شوێنی حەوانەوەی بۆ دابین کرد.

لە شەعبیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەت (فاطمة)ی کچی قەیس، لەربارەی بڕیارەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرامبەر بە خۆی لێم پرسی، فەرمووی: مێردەکەی سێ بە سێ تەڵاقی دا، لەسەر بژێوی و شوێنی حەوانەوە بوو بە کێشەیان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بژێوی و شوێنی حەوانەوەی بۆ بڕیار نەدا.

## دەربارەی پێش مارەبڕین تەڵاقدان نیە

٦ – بَابُ مَا جَاءَ لاَ طَلاَقَ قَبْلَ النِّكَاحِ

١١٨١ – (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَامِرٌ الأَحْوَلُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ نَذْرَ لِابْنِ آدَمَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَلاَ عِتْقَ لَهُ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَلاَ طَلاَقَ لَهُ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي هَذَا البَابِ وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ.

رُوِيَ ذَلِكَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَالحَسَنِ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَعَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ، وَشُرَيْحٍ، وَجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، وَغَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ. وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ فِي الْمَنْصُوبَةِ: إِنَّهَا تَطْلُقُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ، وَالشَّعْبِيِّ وَغَيْرِهِمَا مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُمْ قَالُوا: إِذَا وَقَّتَ نُزِّلَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ أَنَّهُ إِذَا سَمَّى امْرَأَةً بِعَيْنِهَا أَوْ وَقَّتَ وَقْتًا، أَوْ قَالَ: إِنْ تَزَوَّجْتُ مِنْ كُورَةِ كَذَا، فَإِنَّهُ إِنْ تَزَوَّجَ فَإِنَّهَا تَطْلُقُ. وَأَمَّا ابْنُ الْمُبَارَكِ فَشَدَّدَ فِي هَذَا البَابِ وَقَالَ: إِنْ فَعَلَ لاَ أَقُولُ هِيَ حَرَامٌ. وقَالَ أَحْمَدُ: إِنْ تَزَوَّجَ لاَ آمُرُهُ أَنْ يُفَارِقَ امْرَأَتَهُ. وقَالَ إِسْحَاقُ: أَنَا أُجِيزُ فِي الْمَنْصُوبَةِ لِحَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَإِنْ تَزَوَّجَهَا لاَ أَقُولُ تَحْرُمُ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ. وَوَسَّعَ إِسْحَاقُ فِي غَيْرِ الْمَنْصُوبَةِ. وَذُكِرَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ حَلَفَ بِالطَّلاَقِ أَنَّهُ لاَ يَتَزَوَّجُ ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ هَلْ لَهُ رُخْصَةٌ بِأَنْ يَأْخُذَ بِقَوْلِ الفُقَهَاءِ الَّذِينَ رَخَّصُوا فِي هَذَا فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: إِنْ كَانَ يَرَى هَذَا القَوْلَ حَقًّا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُبْتَلَى بِهَذِهِ الْمَسْأَلَةِ، فَلَهُ أَنْ يَأْخُذَ بِقَوْلِهِمْ، فَأَمَّا مَنْ لَمْ يَرْضَ بِهَذَا، فَلَمَّا ابْتُلِيَ أَحَبَّ أَنْ يَأْخُذَ بِقَوْلِهِمْ، فَلاَ أَرَى لَهُ ذَلِكَ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مرۆڤ وەفای نەزری شتێکی لەسەر نیە کە مولکی خۆی نەبێت، ناشتوانێت بەندەیە ئازاد بکات کە هی خۆی نەبێت، وە مافی تەلاقدانی ئافرەتێکی نیە کە مارەبڕاوی شەرعی ئەو نیە).

## دەربارەی تەڵاقی کەنیزەك دوو تەڵاقە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ طَلاَقَ الأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ

١١٨٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي مُظَاهِرُ بْنُ أَسْلَمَ، قَالَ: حَدَّثَنِي القَاسِمُ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: طَلاَقُ الأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ، وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، وحَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُظَاهِرٌ بِهَذَا. وَفِي البَاب عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُظَاهِرِ بْنِ أَسْلَمَ، وَمُظَاهِرٌ لاَ نَعْرِفُ لَهُ فِي العِلْمِ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تەڵاقی کەنیزەك دوو تەڵاقە، ماوەی عیدەکەشی دوو سوڕی مانگانەیە).

## دەربارەی کەسێ لەدڵی خۆیدا ژنەکەی تەڵاقدا

٨- بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُحَدِّثُ نَفْسَهُ بِطَلاَقِ امْرَأَتِهِ

١١٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَجَاوَزَ اللهُ لأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا حَدَّثَ نَفْسَهُ بِالطَّلاَقِ لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ حَتَّى يَتَكَلَّمَ بِهِ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە چاوپۆشی دەکات لەو وەسوەسەیەی کە دێت بە دڵی ئوممەتی منـدا بـە مـەرجێ بـە کـردەوە ئـەنجامی نەدەن و بە زمان نەیڵێن).

## دەربارەی راستی و گاڵتە لە تەڵاقدان

### ٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجِدِّ وَالهَزْلِ فِي الطَّلَاقِ

١١٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَرْدَكَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ مَاهَكَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ، وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلَاقُ، وَالرَّجْعَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ. وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ هُوَ ابْنُ حَبِيبِ بْنِ أَرْدَكَ الْمَدَنِيُّ، وَابْنُ مَاهَكَ هُوَ عِنْدِي يُوسُفُ بْنُ مَاهَكَ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (سـێ شـت هەیـە راسـتیان راستیەو گاڵتەشیان هەر راستیە: ژن مارەکردن و تەڵاقدان و گێڕانەوەشی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی (خلع)[1].

## ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُلْعِ

١١٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَهُوَ مَوْلَى آلِ طَلْحَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ، أَنَّهَا اخْتَلَعَتْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ أُمِرَتْ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ الرُّبَيِّعِ الصَّحِيحُ أَنَّهَا أُمِرَتْ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ.

واتە: لە روبەیعی کچی (معوذ)ی کوڕی عەفرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا صلی اللە علیه وسلم خولعی کرد لەگەڵ مێردەکەی، پێغەمبەریش صلی اللە علیه وسلم یەك بێ نوێژی دانا بۆ ماوە(عدة)کەی.

١١٨٥م- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ بَحْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي عِدَّةِ الْمُخْتَلِعَةِ، فَقَالَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِنَّ عِدَّةَ الْمُخْتَلِعَةِ عِدَّةُ الْمُطَلَّقَةِ ثَلاَثُ حِيَضٍ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِنَّ عِدَّةَ الْمُخْتَلِعَةِ حَيْضَةٌ. قَالَ إِسْحَاقُ: وَإِنْ ذَهَبَ ذَاهِبٌ إِلَى هَذَا فَهُوَ مَذْهَبٌ قَوِيٌّ.

---

[1] (خلع): ئەوەیە ئافرەت شتێك لە مارەییەکەی خۆی کە ڕێك دەکەون لەسەری بداتە مێردەکەی بۆ ئەوەی لە بەرامبەریدا تەڵاقی بدات.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، ژنەکەی (ثابت)ی کوڕی قەیس خولعی کرد لەگەڵ مێردەکەی، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم یەك بێ نوێژی دانا بۆ ماوە(عدة)کەی.

زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش دەفەرموون: ماوە(عدة)ی ژنی تەڵاقدراو و ئەوەی خولع بکات لەگەڵ مێردەکەی، سێ بێ نوێژییە، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفەیە، ئەحمەد و ئیسحاق ئەمە دەفەرموون. هەندێکی تریان دەفەرموون: ماوە(عدة)ی ژنێ خولع بکات لەگەڵ مێردەکەی یەك بێ نوێژییە.

### ئەو ژنانەی کە خولع دەکەن لەگەڵ مێردەکانیان

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُخْتَلِعَاتِ

١١٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُزَاحِمُ بْنُ ذَوَّادِ بْنِ عُلْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ أَبِي الخَطَّابِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ. وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ لَمْ تَرِحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو ژنانەی کە ماڵی خۆیان دەدەن بۆ ئەوەی مێردەکانیان تەڵاقیان بدەن، ئەوانە لەپێڕی دووڕووەکانن. هەروەها لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هەر ژنێ بەبێ بەهانەیەکی شەرعی داوای خولع بکات لەگەڵ مێردەکەی بۆنی بەهەشت ناکات).

١١٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ بُنْدَارٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَمَّنْ حَدَّثَهُ، عَنْ ثَوْبَانَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقًا مِنْ غَيْرِ بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَيُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ. وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ، عَنْ أَيُّوبَ بِهَذَا الإِسْنَادِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر ژنێ بەبێ بەهانەیەکی شەرعی داوای جیابوونەوە بکات لە مێردەکەی بۆنی بەهەشت ناکات).

## هەڵکردن و پێکەوە ژیانی ژن و مێرد لەگەڵ یەك

١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُدَارَاةِ النِّسَاءِ

١١٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ كَالضِّلَعِ إِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ تَرَكْتَهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا عَلَى عِوَجٍ. لالاشسوَفِي البَاب عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَسَمُرَةَ، وَعَائِشَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَإِسْنَادُهُ جَيِّدٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەت وەك پەراسوو وایە ئەگەر بتەوێ ڕاستی کەیتەوە دەشکێ، ئەگەر وازیشی لێ بهێنی هەروا بەلاری دەمێنێتەوە).

## دەربارەی پیاوێ باوکی داوای لێ بکات لەژنەکەی جیابێتەوە

### ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَسْأَلُهُ أَبُوهُ أَنْ يُطَلِّقَ زَوْجَتَهُ

١١٨٩ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ أُحِبُّهَا، وَكَانَ أَبِي يَكْرَهُهَا، فَأَمَرَنِي أَبِي أَنْ أُطَلِّقَهَا، فَأَبَيْتُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، طَلِّقْ امْرَأَتَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هاوسەرێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست، بەڵام باوکم خۆشی نەدەویست، بۆیە فەرمانی پێ کردم کە تەڵاقی بدەم، منیش تەڵاقم نەداو گوێڕایەڵی فەرمایشتەکەی باوکم نەبووم، بەسەرهاتەکەم بۆ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم گێڕایەوە، فەرمووی: (ئەی (عبد الله)ی کوڕی عومەر تەڵاق بدە).

## دروست نیە ئافرەت داوای تەڵاقدانی خوشکی موسوڵمانی بکات

### ١٤ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا

١١٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَكْفِئَ مَا فِي إِنَائِهَا. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (نابێ ئافرەتی موسوڵمان داوای تەڵاقدانی خوشکی موسوڵمانی بکا، بۆ ئەوەی جێی بگرێتەوە، یا شوو بکات بە پیاوێکی تر).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی تەلاقی کەم عەقڵ

### ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طَلاَقِ الْمَعْتُوهِ

١١٩١ - **(ضعيف جدا، والصحيح موقوف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ قَالَ: أَنْبَأَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ الفَزَارِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ الْمَخْزُومِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُلُّ طَلاَقٍ جَائِزٌ، إِلاَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَطَاءِ بْنِ عَجْلاَنَ، وَعَطَاءُ بْنُ عَجْلاَنَ ضَعِيفٌ ذَاهِبُ الحَدِيثِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ لاَ يَجُوزُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعْتُوهًا يُفِيقُ الأَحْيَانَ فَيُطَلِّقُ فِي حَالِ إِفَاقَتِهِ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو تەڵاقدانێ دروستە، جگە لە تەڵاقی کەم عەقڵ ئەوەی عەقڵی لەدەست دابێ).**

**بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش: ئەوەی عەقڵی لەدەست دابێ تەڵاقی دروست نیە، مەگەر هەندێ جار بێتەوە هۆش خۆی و لەوکاتەدا تەڵاقی بدات.**

### باسێکی تر لەوبارەوە

### ١٦ - بَابٌ

١١٩٢ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْلَى بْنُ شَبِيبٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ وَالرَّجُلُ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ مَا شَاءَ أَنْ يُطَلِّقَهَا، وَهِيَ امْرَأَتُهُ إِذَا ارْتَجَعَهَا وَهِيَ فِي العِدَّةِ، وَإِنْ طَلَّقَهَا مِائَةَ مَرَّةٍ أَوْ أَكْثَرَ، حَتَّى قَالَ رَجُلٌ

لِامْرَأَتِهِ: وَاللهِ لاَ أُطَلِّقُكِ فَتَبِينِي مِنِّي، وَلاَ آوِيكِ أَبَدًا، قَالَتْ: وَكَيْفَ ذَاكَ؟ قَالَ: أُطَلِّقُكِ، فَكُلَّمَا هَمَّتْ عِدَّتُكِ أَنْ تَنْقَضِيَ رَاجَعْتُكِ، فَذَهَبَتِ الْمَرْأَةُ حَتَّى دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ فَأَخْبَرَتْهَا، فَسَكَتَتْ عَائِشَةُ، حَتَّى جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَتْهُ، فَسَكَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَاسْتَأْنَفَ النَّاسُ الطَّلاَقَ مُسْتَقْبَلاً مَنْ كَانَ طَلَّقَ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ طَلَّقَ. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ بِمَعْنَاهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ يَعْلَى بْنِ شَبِيبٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاو هەرکاتێ بیویستایە ژنەکەی تەلاق ئەدا، وە هەر ژنی دەبوو ئەگەر لە عیدەکەیدا بیگێڕایەتەوە ئەگەر سەد جار یان زیاتریش تەلاقی بدایە، هەتا پیاوێ بە ژنەکەی وت: سوێند بە (الله) وات تەلاق نادەم دەسستت لێم ببێتەوە، وە هەرگیز ناتهێنمەوە، ژنەکە وتی: چۆن دەبێت؟ پیاوەکە وتی: تەلاق ئەدەم، هەرکاتێ نزیک بوو عیدەکەت تەواو ببێ دەتگێڕمەوە بۆ ژێر رکێفی خۆم، ژنەکە هەستا چوو بۆ خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، عائیشە بێدەنگ بوو هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەوە، بەسەرهاتەکەی پێ راگەیاند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ). سورة البقرة: ٢٢٤. واتە: تەلاقێ کە پیاو بتوانێ ژنەکەی پێ بگێڕێتەوە دوو جارە، حوکمی خوا لەدوای ئەو دوو تەلاقە ئەوەیە یان رایبگرێ بە چاکی، یا لێی جیابێتەوە بە چاکی.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئیتر لەوە بەدواوە خەڵك بە مەسەلەی تەلاقدا دەچوونەوە، ئەوەی کە ژنی تەلاق دابوو، ئەوەشی کە ژنی تەلاق نەدابوو.

## دەربارەی ئافرەتێکی سکپڕ مێردەکەی بمرێت و مندالّی ببیّ

## ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَامِلِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا تَضَعُ

١١٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِي السَّنَابِلِ بْنِ بَعْكَكٍ قَالَ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِثَلاَثَةٍ وَعِشْرِينَ، أَوْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ يَوْمًا، فَلَمَّا تَعَلَّتْ تَشَوَّفَتْ لِلنِّكَاحِ، فَأُنْكِرَ عَلَيْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنْ تَفْعَلْ فَقَدْ حَلَّ أَجَلُهَا. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ نَحْوَهُ. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. حَدِيثُ أَبِي السَّنَابِلِ حَدِيثٌ مَشْهُورٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلاَ نَعْرِفُ لِلأَسْوَدِ سَمَاعًا مِنْ أَبِي السَّنَابِلِ وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: لاَ أَعْرِفُ أَنَّ أَبَا السَّنَابِلِ عَاشَ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الحَامِلَ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا إِذَا وَضَعَتْ فَقَدْ حَلَّ التَّزْوِيجُ لَهَا، وَإِنْ لَمْ تَكُنِ انْقَضَتْ عِدَّتُهَا. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: تَعْتَدُّ آخِرَ الأَجَلَيْنِ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سوبەیعە لەدوای وەفاتی مێردەکەی بە بیست و سێ ڕۆژ یان بیست و پێنج ڕۆژ سکەکەی دانا، کاتێ کە پاك بوویەوە لە خوێنی مندالّ بوون خۆی رازاندەوە و خۆی ئامادەکرد بۆ شوکردن، ئینکاریان کرد، ئەوە باسکرا بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەگەر ئەو کارە بکات ئەوە هەقی خۆیەتی شوو بکات و عیدەی تەواو کردووە).

١١٩٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَابْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ تَذَاكَرُوا الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا الحَامِلَ تَضَعُ عِنْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تَعْتَدُّ آخِرَ الأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: بَلْ تَحِلُّ حِينَ تَضَعُ، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي، يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ، فَأَرْسَلُوا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: قَدْ وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ الأَسْلَمِيَّةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِيَسِيرٍ، فَاسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَزَوَّجَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەبو هورەیرە و ئیبنو عەباس و ئەبو سەلەمەی كوڕی (عبد الرحمن) ڕەزای خوایان لێ بێ باسی ئافرەتی سكپڕیان كرد پیاوەكەی بمرێ و منداڵی ببێ، ئیبنو عەباس فەرمووی: لە دوو عیددەكە واتە دانی سكەكەی و چوار مانگ و دە ڕۆژەكە، عیددەی كۆتاهەمینیانە، ئەبو سەلەمە فەرمووی: هەركاتێ سكەكەی دانا بۆی هەیە شوو بكات، ئەبو هورەیرە فەرمووی: من لەگەڵ برزاكەمم واتە ئەبو سەلەمە، ناردیان بۆ لای ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: سوبەیعەی ئەسلەمی لەدوای وەفاتی مێردەكەی بە ماوەیەكی كەم سكەكەی دانا، دەربارەی شوكردنی پرسیاریان كرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش فەرمانی پێ كرد شوو بكات.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی عیدەی ئافرەتێ مێردەكەی بمرێ

## ١٨ – بَابُ مَا جَاءَ فِي عِدَّةِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا

حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ بِهَذِهِ الأَحَادِيثِ الثَّلاَثَةِ:

١١٩٥ - (صحيح) قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ خَلُوقٌ، أَوْ غَيْرُهُ، فَدَهَنَتْ بِهِ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا.

واتە: زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە دەفەرموویت: چوم بۆلای ئوممو حەبیبە کاتێ کە ئەبو سوفیانی باوکی مرد، جا ئوممو حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تێدا بوو، دەستی کرد بە ناویداو هێنای بە هەردوو لای رووومەتیدا، لە پاشدا وتی: سوێند بە (الله) هیچ پێویستم بە بۆنی خۆش نیە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە لە پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ کە باوەڕی بە خوای گەورە و بە رۆژی قیامەت هەیە بۆی دروست نیە لە سێ شەو زیاتر ماتەم بگرێ بۆ مردو، مەگەر بۆ مێردەکەی، دەبێ بۆ مێردەکەی چوار مانگ و دە رۆژ تازیە بگرێ).

١١٩٦ - (صحيح) قَالَتْ زَيْنَبُ: فَدَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ، فَمَسَّتْ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي فِي الطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا.

واتە: زەینەب دەفەرموویت: چوم بۆلای زەینەی کچی جەحش کاتێ کە براکەی مرد، داوای بۆنی خۆشی کرد، بۆیان هێنا دای لە خۆی، لە پاشدا وتی: سوێند بە (الله) هیچ پێویستم بە بۆنی خۆش نیە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە لە پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بیستوە لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ کە

باوەڕی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی قیامەت هەیە بۆی دروست نیە لە سێ شەو زیاتر ماتەم بگرێ بۆ مردو، مەگەر بۆ مێردەکەی، دەبێ بۆ مێردەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیە بگرێ).

١١٩٧ - (صحيح) قَالَتْ زَيْنَبُ: وَسَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ، تَقُولُ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَقَدْ اشْتَكَتْ عَيْنَيْهَا، أَفَنَكْحَلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ لاَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الحَوْلِ. وَفِي البَاب عَنْ فُرَيْعَةَ بِنْتِ مَالِكٍ أُخْتِ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، وَحَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ. حَدِيثُ زَيْنَبَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا تَتَّقِي فِي عِدَّتِهَا الطِّيبَ وَالزِّينَةَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: زەینەب دەفەرموویت: گوێم لە دایکم واتە ئەمو سەلەمە بوو فەرمووی: ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کچەکەم مێردەکەی مردوەو چاوی دێشێت، چاوی بڕێژێ؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر) دوو تا سێ جار بەو شێوەیە فەرمووی: (نەخێر، با چاوی نەڕێژێ) لە پاشدا فەرمووی: (خۆی تا چوار مانگ و دە شەوە، کەچی ئێوە پەلەتانە، لەسەردەمی جاهیلی دا لەپاش سالێ ئینجا پشقلەکەیتان فڕێ دەدا).

بە پەیڕەوکردنی ئەمە هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و جگە لەوان: دەبێ ئافرەت لەکاتی عیدەدا خۆی بپارێزێ لەبۆنی خۆش و خۆڕازاندنەوە. ئەمەش وتەی سوفیان و مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## دەربارەی (مُظَاهِر) جووت بێ پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدا

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُظَاهِرِ يُوَاقِعُ قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ

١١٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ البَيَاضِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمُظَاهِرِ يُوَاقِعُ قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ قَالَ: كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَمَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا وَاقَعَهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ فَعَلَيْهِ كَفَّارَتَانِ. وَهُوَ قَوْلُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَهْدِيٍّ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی صەخرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، دەربارەی (مُظَاهِر) جووت پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدا فەرموویەتی: (یەك جار کەفارەتی لەسەرە). - (مُظَاهِر) ئەو کەسەیە کە بە ژنەکەی بڵێ پشتی تۆ وەك پشتی دایکم وایە، یان بیچوێنێ بە یەکێ لە مەحرەمەکانی -.

زۆربەی زانایان پەیڕەوی ئەمە دەکەن، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تریان دەفەرموون: ئەگەر جووت ببێ پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدا، ئەوە دوو جار کەفارەتی لەسەرە، ئەمەش وتەی (عبد الرحمن)ی کوڕی مەهدیە.

١١٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الحَكَمِ بْنِ أَبَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ ظَاهَرَ مِنْ امْرَأَتِهِ، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ ظَاهَرْتُ مِنْ زَوْجَتِي، فَوَقَعْتُ عَلَيْهَا قَبْلَ أَنْ أُكَفِّرَ، فَقَالَ: وَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ

يَرْحَمُكَ اللَّهُ؟، قَالَ: رَأَيْتُ خَلْخَالَهَا فِي ضَوْءِ القَمَرِ، قَالَ: فَلاَ تَقْرَبْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَكَ اللَّهُ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بە ژنەكەی وتبوو: پشتی تۆ وەك پشتی دایكم وایە، جووتبوویبوو لەگەڵی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، من بە ژنەكەی خۆمم وت: پشتی تۆ وەك پشتی دایكم وایە، پێش ئەوەی كەفارەتەكەی بدەم جووتبووم لەگەڵی، فەرمووی: (رەحمەتی خوات لێ بێ چی وای لێ كردی؟)، وتی: لەبەر روناكی مانگە شەودا خڵخاڵەكانیم بینی خۆمم پێ نەگیرا، فەرمووی: (نزیكی مەبەرەوە هەتا ئەو بڕیارە جێ بەجێ دەكەیت كە خوا بۆی داناویت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی كەفارەتی (ظِّهَار).

٢٠ – بَابُ مَا جَاءَ فِي كَفَّارَةِ الظِّهَارِ

١٢٠٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الخَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، أَنَّ سَلْمَانَ بْنَ صَخْرٍ الأَنْصَارِيَّ، أَحَدَ بَنِي بَيَاضَةَ جَعَلَ امْرَأَتَهُ عَلَيْهِ كَظَهْرِ أُمِّهِ حَتَّى يَمْضِيَ رَمَضَانُ، فَلَمَّا مَضَى نِصْفٌ مِنْ رَمَضَانَ وَقَعَ عَلَيْهَا لَيْلاً، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَعْتِقْ رَقَبَةً، قَالَ: لاَ أَجِدُهَا، قَالَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ، قَالَ: أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا، قَالَ: لاَ أَجِدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِفَرْوَةَ بْنِ عَمْرٍو: أَعْطِهِ ذَلِكَ العَرَقَ وَهُوَ مِكْتَلٌ يَأْخُذُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا،

أَوْ سِتَّةَ عَشَرَ صَاعًا إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. يُقَالُ: سَلْمَانُ بْنُ صَخْرٍ، وَيُقَالُ: سَلَمَةُ بْنُ صَخْرٍ البَيَاضِيُّ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي كَفَّارَةِ الظِّهَارِ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەو موحەممەدی کوڕی (عبد الرحمن)ی کوڕی (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە، کە سەلمانی کوڕی صەخری ئەنصاری، یەکێ بوو لە (بَنِي بَيَاضَةَ)، (ظِّهَار)ی لە ژنەکەی کرد تا رەمەزان تەواو دەبێت، جا کاتێ کە نیوەی مانگی رەمەزان تێپەڕی شەو چووبووە لای ژنەکەی، بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسەرهات و هەواڵی خۆی پێ راگەیاند، ئەویش فەرمووی: (کۆیلەیە رزگار بکە). وتی: نیمە، فەرمووی: (دەی دوو مانگ بەسەر یەکەوە رۆژوو بگرە). وتی: ناتوانم، فەرمووی: (دە خواردنی شەست هەژار و کەمدەست بدە). وتی: نیمە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە فەروەی کوڕی عەمری فەرموو: (ئەوەندەی خورما بدەرێ با دەرخواردی شەست هەژار و کەمدەستی بدات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەفارەتی (إِيلاَءِ).

٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِيلاَءِ

١٢٠١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ قَزَعَةَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَسْلَمَةُ بْنُ عَلْقَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: آلَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نِسَائِهِ، وَحَرَّمَ، فَجَعَلَ الحَرَامَ حَلاَلاً، وَجَعَلَ فِي اليَمِينِ كَفَّارَةً. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي مُوسَى. حَدِيثُ مَسْلَمَةَ بْنِ عَلْقَمَةَ، عَنْ دَاوُدَ، رَوَاهُ عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، وَغَيْرُهُ، عَنْ دَاوُدَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

وَلَيْسَ فِيهِ عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مَسْلَمَةَ بْنِ عَلْقَمَةَ. وَالإِيلاَءُ: هُوَ أَنْ يَحْلِفَ الرَّجُلُ أَنْ لاَ يَقْرَبَ امْرَأَتَهُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ فَأَكْثَرَ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِيهِ إِذَا مَضَتْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِذَا مَضَتْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ يُوقَفُ، فَإِمَّا أَنْ يَفِيءَ، وَإِمَّا أَنْ يُطَلِّقَ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِذَا مَضَتْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ فَهِيَ تَطْلِيقَةٌ بَائِنَةٌ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ژنەکانی لەسەر خۆی حەرام کرد، لەپاشدا ئەوەی حەرامی کردبوو حەلاڵی کردەوەو کەفارەتی سوێندەکەی دا.

(إِيلاَء) ئەمەیە: پیاو سوێند بخوا نزیکی ژنەکەی نەکەوێ و لەسەر خۆی حەرامی بکا هەتا چوار مانگ و زیاتریش، زانایان رایان جیاوازە لەوبارەوە، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و جگە لەوانیش دەفەرموون: ئەگەر لە چوار مانگ تێپەڕی تەلاقی ناکەوێ، یان ئەوەتا دەیگێڕێتەوە، یا تەلاقی دەدات، ئەمەش وتەی پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تر لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و جگە لەوانیش دەفەرموون: ئەگەر لە چوار مانگ تێپەڕی ئەوە تەلاقی بائینە، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیان و خەڵکی کوفەیە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شەرەنەفرین

## ٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اللِّعَانِ

١٢٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ فِي إِمَارَةِ مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ، فَقُمْتُ مَكَانِي إِلَى مَنْزِلِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ اسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَقِيلَ لِي: إِنَّهُ قَائِلٌ، فَسَمِعَ كَلاَمِي، فَقَالَ: ابْنُ جُبَيْرٍ ادْخُلْ، مَا جَاءَ بِكَ إِلاَّ حَاجَةٌ؟ قَالَ: فَدَخَلْتُ، فَإِذَا هُوَ مُفْتَرِشٌ بَرْذَعَةَ رَحْلٍ لَهُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُتَلاَعِنَانِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللهِ، نَعَمْ، إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ، أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ أَحَدَنَا رَأَى امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ تَكَلَّمَ، تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ، سَكَتَ عَلَى أَمْرٍ عَظِيمٍ. قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ. فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّ الَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدْ ابْتُلِيتُ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآيَاتِ الَّتِي فِي سُورَةِ النُّورِ: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ) حَتَّى خَتَمَ الآيَاتِ فَدَعَا الرَّجُلَ، فَتَلاَ الآيَاتِ عَلَيْهِ، وَوَعَظَهُ، وَذَكَّرَهُ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ فَقَالَ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا. ثُمَّ ثَنَّى بِالمرْأَةِ، فَوَعَظَهَا، وَذَكَّرَهَا، وَأَخْبَرَهَا أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، فَقَالَتْ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا صَدَقَ. قَالَ: فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ، فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الكَاذِبِينَ. ثُمَّ ثَنَّى بِالمرْأَةِ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الكَاذِبِينَ، وَالخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ. ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. وَفِي البَاب عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَحُذَيْفَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتـە: لـە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: کاتێ موصعەبی کوڕی زوبێـر فـەرمانڕەواو کاربەدەسـتی عێـراق بـوو دەربارەی ئەو ژن ومێردەی کە لەنێوان خۆیاندا شەڕەنەفرین دەکەن پرسیارم لێ کرا، کە ئایا جیادەکرێنەوە لەیـەکتر یـان نـا؟ منـیش نـەمزانی بڵێم چـی، لـەجێی خـۆم هەستام و چووم بۆ ماڵی (عبد الله)ی کوڕی عومـەر ڕەزای خوایـان لـێ بـێ، داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەم کرد، نۆکەرەکەی پێی وتم: خەوتووە و خەوی قەیلولە نیوەی ڕۆژ دەکات، بەڵام خۆی گوێی لەدەنگم بوو فەرمووی: ئیبنو جوبـەیر وەرە ژوورەوە، دیارە بۆ کارێکی گرنك و پێویست تۆی هێناوە، فـەرمووی: چـوومەژوورەوە دەڕوانم لەسـەر جلـی وشـترەکەی خـۆی دانیشـتووە، وتم: ئـەی (ابـا عبـد الـرحمن) ئـەو ژن ومێردەی کە لەنێوان خۆیاندا شەڕەنەفرین دەکـەن جیادەکرێنـەوە لەیـەکتر یـان نـا؟ فەرمووی: پاك بێگەردی بۆ خوای گەورە ئەی چۆن جیاناکرێنەوە، یەکەم کـەس کـە پرسیاری کرد لەوبارەوە فلانی کوڕی فلان بـوو، هـات بـۆ لای پێغەمبـەر صـلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەگەر کەسێ لە ئێمـە چوو بەسەر ژنەکەیدا داوێن پیسی دەکرد چی بکات؟ ئەگەر قسە بکات ئـەوە قسـە لەسەر کارێکی گەورە و گرنگ دەکات، خـۆ ئەگـەر بێـدەنگیش بێـت ئـەوە لەسـەر کارێکی گەورە و گرنگ بێ دەنـگ دەبـێ، فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم بێ دەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە، پاش ماوەیە هاتەوە بۆ لای پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئەوەی دەربارەی پرسیارم لێ کـردی ئـەوەتا بەسـەر خـۆم هاتووە، جا خوای گـەورە ئـەم ئایـەتانی سـورەتی نـوری دابەزانـد: (**وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ**).سورة النور:٦ -٧. واتە: ئەو کەسانەی کـە تۆمـەتی زینـا دەدەنـە پـاڵ هاوسـەرانیان، لەهـەمان

کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نیە شایەتییان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردوە، چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لەکۆڵ بکەوێت - ئەگەر شایەد نەبوو - دەبێت هەر یەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بە خوا و بڵێت: بەڕاستی من لە لەڕاستگۆیانم " کە دەڵێم ئەم ژنەم زینای کردووە " وە بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێ ئەگەر لە درۆزنان بم.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوەکەی بانگ کردوو ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندەوە و ئامۆژگاری کردو سزاو تۆڵەی قیامەتی یاد خستەوە و پێی ڕاگەیاند کە سزاو تۆڵەی قیامەت سەخت ترە لە سزاو تۆڵەی دونیا، وتی: سوێند بە (الله) کە تۆی بە هەق ڕەوانەکردووە ڕاست دەکەم بەو شێوەیە بوو کە وتم درۆی بۆ هەڵنابەستم، جا ژنەکەی بانگ کردوو ئایەتەکانی بەسەردا خوێندەوە و ئامۆژگاری کردو سزاو تۆڵەی قیامەتی یاد خستنەوە و پێی ڕاگەیاند کە سزاو تۆڵەی قیامەت سەخت ترە لە سزاو تۆڵەی دونیا، وتی: سوێند بە (الله) کە تۆی بە هەق ڕەوانەکردووە ڕاست ناکات و بوختانم بۆ دەکات، فەرمووی: لە پیاوەکەوە دەستی پێ کرد، چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە لە ڕاستگۆیانە، لە پێنجەم جاردا شایەتی دا وتی: نەعلەتی خوام لێ بێ ئەگەر لە درۆزنان بم و بوختانی بۆ بکەم، لەپاشدا ژنەکەش چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە لە ڕاستگۆیانەو مێردەکەی لە درۆزنانەو بوختانی بۆ دەکات، لە پێنجەم جاردا شایەتی دا وتی: غەزەب و قاری خوام لێ بێ ئەگەر مێردەکەم ڕاست بکات، ئیتر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەیەکتری جیاکردنەوە.

١٢٠٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: لاَعَنَ رَجُلٌ امْرَأَتَهُ، وَفَرَّقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الوَلَدَ بِالأُمِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ ژنەکەی بە زیناکار دایە قەڵەم و شەرەنەفرینیان کرد، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جیای کردنەوە لەیەکتر و منداڵەکەی دا بە ئافرەتەکە.

## ژنێ مێردەکەی بمرێ لەکوێ عیددەکەی تەواو بکات

٢٣ – بَابُ مَا جَاءَ أَيْنَ تَعْتَدُّ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا؟

١٢٠٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنْ عَمَّتِهِ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ الفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ وَهِيَ أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَخْبَرَتْهَا أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ، وَأَنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا، حَتَّى إِذَا كَانَ بِطَرَفِ القَدُومِ لَحِقَهُمْ فَقَتَلُوهُ. قَالَتْ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي، فَإِنَّ زَوْجِي لَمْ يَتْرُكْ لِي مَسْكَنًا يَمْلِكُهُ وَلاَ نَفَقَةً، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ. قَالَتْ: فَانْصَرَفْتُ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الحُجْرَةِ، أَوْ فِي الْمَسْجِدِ، نَادَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ أَمَرَ بِي فَنُودِيتُ لَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ قُلْتِ؟، قَالَتْ: فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ القِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ لَهُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي، قَالَ: امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الكِتَابُ أَجَلَهُ. قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ

سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ إِسْحَاقَ بْنِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ فَذَكَرَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: لَمْ يَرَوْا لِلْمُعْتَدَّةِ أَنْ تَنْتَقِلَ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا حَتَّى تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَعْتَدَّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَإِنْ لَمْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجرە دەڵێت: فورەیعەی کچی مالیکی کوڕی سینان خوشکی ئەبو سەعیدی خودری، بۆ زەینەبی گێڕایەوە کە هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای لێ کردوە کە بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری لە بەنی خودرە، چونکە مێردەکەی چوو بوو بەشوێن چەند بەندەیەکیدا دەگەڕا کە هاڵهاتبون، هەتا لەناوچەی قەدوم پێیان گەیشت ئەوانیش کوشتیان، فورەیعە وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە بگەڕێمەوە بۆ ناو کەسوکارم، چونکە مێردەکەم نە خانوی خۆی بۆ بەجێ هێشتوم نە خەرجی؟ فورەیعە وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بەڵێ). فورەیعە وتی: کاتێ کە لە مزگەوت یان لە حوجرەکە دەرچووم بانگی کردم، یان فەرمانی دا بانگ کرام، فەرمووی: (چیت وت؟) منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە دەربارەی مێردەکەم، فورەیعە وتی: فەرمووی: (هەر لەوماڵەی کە هەواڵی مردنی مێردەکەت پێ گەیشتوە بمێنەرەوە، هەتا عیددەت تەواو دەبێ). فورەیعە وتی: منیش چوار مانگ و دە شەو لەو شوێنەدا مامەوە هەتا عیددەکەم تەواو کرد، فورەیعە وتی: کاتێ کە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان ناردی بە شوێنمدا لەوبارەوە پرسیاری لێ کردم، منیش بۆم گێڕایەوە، ئەویش لەسەری ڕۆیشت و حوکمی پێ کرد.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش پێیان وایە: ئەگەر ژنێ مێردەکەی مرد لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە و نەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر هەتا ماوە(عدە)کەی تەواو دەکات، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێکی تر لەزانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش پێیان وایە: ئەگەر ژن مێردەکەی مرد ئارەزووی خۆیەتی لەهەرکوێ ماوە(عدە)کەی تەواو دەکات. پێشەوا (ترمذي) دەفەرمووێ: رای یەکەم دروست ترە.

# باسەکانی کڕین و فرۆشتن لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ١٢ - أَبْوَابُ الْبُيُوعِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### خۆپاراستن لە گومان و ئەو شتانەی کە شوبهەیان تێدایە

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الشُّبُهَاتِ

١٢٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الحَلاَلُ بَيِّنٌ وَالحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، لاَ يَدْرِي كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ أَمِنَ الحَلاَلِ هِيَ أَمْ مِنَ الحَرَامِ، فَمَنْ تَرَكَهَا اسْتِبْرَاءً لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ فَقَدْ سَلِمَ، وَمَنْ وَاقَعَ شَيْئًا مِنْهَا، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَ الحَرَامَ، كَمَا أَنَّهُ مَنْ يَرْعَى حَوْلَ الحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللهِ مَحَارِمُهُ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ.

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی ئەو کاروکردەوانەی حەڵاڵ کراون لەلایەن خوای گەورەوە روون و ئاشکراو دیارن، هەروەها ئەو کاروکردەوانەش کە حەرام کراون لەلایەن خوای گەورەوە روون و ئاشکراو دیارن، لەنێوان ئەم دوانەدا هەندێ شت هەن جێگەی

گومانن حەڵاڵی و حەرامییان روون و ئاشکرا نیە زۆرکەس نازانن حەڵاڵن یان حەرامن، جا ئەوەی خۆی بپارێزێ لە شتی گومان لێکراو ئەوە دین و ناموسی خۆی دەپارێزێت و سەلامەت دەبێ، هەرکەسێك نزیك بێتەوە لە شتی گومان لێکراو ئەوە نزیکە بکەوێتە ناو حرامەوە، وەك چۆن شوان ئەگەر رانەکەی لەدەوروبەری پاوەندا بلەوەڕێنێ نزیکە بکەوێتە ناویەوە - واتە هەرکەس لێی بەدوور بێت سەلامەتە -، ئاگاداربن هەموو کاربەدەستێ پاوەنی خۆی هەیەو دەپارێزێ، پاوەنی خوای گەورەش ئەوشتانەیە کە حەرامی کردون).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سوود خواردن

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ الرِّبَا

١٢٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَكَاتِبَهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەفرەتی کردوە لە سوود خۆر و سوود وەرگر و لەو کەسەی کە دەبێت بە شایەت و لەو کەسەش کە دەینوسێت).

## دەربارەی هەڕەشەی توند لەو کەسانەی کە درۆدەکەن

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّغْلِيظِ فِي الكَذِبِ وَالزُّورِ وَنَحْوِهِ

١٢٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الكَبَائِرِ، قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَقَوْلُ الزُّورِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، وَأَيْمَنَ بْنِ خُرَيْمٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی تاوانە گەورەکان فەرموویەتی: (بریتین لە مانە: هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، تەرکی سەردانی باوك و دایك و ئازاردانیان، کوشتنی کەسێ بە ناهەق، درۆکردن).

## دەربارەی بازرگانەکان و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چ ناوێکی لێ ناون

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التُّجَّارِ وَتَسْمِيَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِيَّاهُمْ

١٢٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، إِنَّ الشَّيْطَانَ، وَالإِثْمَ يَحْضُرَانِ البَيْعَ، فَشُوبُوا بَيْعَكُمْ بِالصَّدَقَةِ. وَفِي البَاب عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، وَرِفَاعَةَ. حَدِيثُ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. رَوَاهُ مَنْصُورٌ، وَالأَعْمَشُ، وَحَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ، وَلاَ نَعْرِفُ لِقَيْسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ هَذَا. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ

١٢٨٩ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ؟ فَقَالَ: مَنْ أَصَابَ مِنْهُ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە دەربارەی خواردنی بەروبووم بەدارەوە پرسیاریان كرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەگەر كەسێ ناچار بوو پێویستی كرد دروستە لێی بخوات بەمەرجێ بەرچاكی لێ پڕ نەكات و لێی نەباتەوە).

## ڕێگریكردن لە شتێ بڕەكەی نەزانراو بێ

### ٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الثُّنْيَا

١٢٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبَّادُ بْنُ العَوَّامِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي سُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالمزَابَنَةِ، وَالمخَابَرَةِ، وَالثُّنْيَا، إِلاَّ أَنْ تُعْلَمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ يُونُسَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەری دار خوارماو بەرسیلەی ترێ بە دارەوەو، لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی و، لە كشتوكاڵ كردن لەزەویەكدا تۆوەكە لەسەر كرێكار بێت بە سێ یەك یان چوار یەك، وە نەهی كردوە لەوەی بۆ نمونە یەكێ بە كەسێ بڵێ: ئەم پەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت چارەكێكی نەبێ، مەگەر شتێكی زانراو و دیاریكراو بێت.

## دەربارەی قەدەغەکردنی فرۆشتنی خۆراك هەتا وەرنەگیرێ

## ٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ بَيْعِ الطَّعَامِ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ

١٢٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَحْسِبُ كُلَّ شَيْءٍ مِثْلَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا بَيْعَ الطَّعَامِ حَتَّى يَقْبِضَهُ الْمُشْتَرِي، وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِيمَنْ ابْتَاعَ شَيْئًا مِمَّا لاَ يُكَالُ وَلاَ يُوزَنُ مِمَّا لاَ يُؤْكَلُ وَلاَ يُشْرَبُ، أَنْ يَبِيعَهُ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفِيَهُ، وَإِنَّمَا التَّشْدِيدُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي الطَّعَامِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خۆراکێکی کڕی نەیفرۆشێت بە کەسێکی تر هەتا بە کێشانە بەتەواوی وەری دەگرێت). ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: پێم وایە هەموو شتێ بەو شێوەیەیە.

## قەدەغەکردنی مامەڵە بەسەر مامەڵەی برای موسوڵماندا

## ٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ البَيْعِ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ

١٢٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ يَخْطُبُ بَعْضُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ بَعْضٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَمُرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَسُومُ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ وَمَعْنَى البَيْعِ فِي هَذَا الحَدِيثِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: هُوَ السَّوْمُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەندێکتان مامەڵە مەکەن بەسەر مامەڵەی هەندێکتاندا، هەندێکتان خوازبێنی مەکەن بەسەر خوازبێنی هەندێکتاندا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فرۆشتنی شەراب و قەدەغەکردنی

## ٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعِ الخَمْرِ وَالنَّهْيِ عَنْ ذَلِكَ

١٢٩٣ - (حسن) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ لَيْثًا يُحَدِّثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنِّي اشْتَرَيْتُ خَمْرًا لأَيْتَامٍ فِي حِجْرِي، قَالَ: أَهْرِقِ الخَمْرَ، وَاكْسِرِ الدِّنَانَ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي طَلْحَةَ، رَوَى الثَّوْرِيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ كَانَ عِنْدَهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ.

واتە: لە ئەبو (طلحة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەرابم کڕیوە لەپێناوی ئەو هەتیوانەدا بەخێویان دەکەم، فەرمووی: (شەرابەکە بڕێژە و دەفرەکەش بشکێنە).

## قەدەغەکردنی شەراب کردنەوە بە سرکە

### ٥٩ - بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُتَّخَذَ الخَمْرُ خَلًّا

١٢٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُتَّخَذُ الخَمْرُ خَلًّا؟ قَالَ: لاَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە،، کە فەرموویەتی: پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کە ئایا دروستە شەراب بکرێتەوە بە سرکە؟ فەرمووی: (نەخێر دروست نیە).

١٢٩٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُنِيرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عَاصِمٍ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ بِشْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الخَمْرِ عَشَرَةً: عَاصِرَهَا، وَمُعْتَصِرَهَا، وَشَارِبَهَا، وَحَامِلَهَا، وَالمحْمُولَةُ إِلَيْهِ، وَسَاقِيَهَا، وَبَائِعَهَا، وَآكِلَ ثَمَنِهَا، وَالمشْتَرِي لَهَا، وَالمشْتَرَاةُ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ. وَقَدْ رُوِيَ نَحْوُ هَذَا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی شەرابەوە نەفرەتی کردووە لە دە کەس: (ئەو کەسەی دەیگوشێت و ئاوەکەی دەگرێ و ئامادەی دەکا، ئەو کەسەی بۆی دەگوشن و بۆی ئامادە دەکەن، ئەو کەسەی دەیخواتەوە، ئەو کەسەی هەڵی دەگرێت و دەیگوێزێتەوە، ئەو کەسەی بۆی دەگوێزنەوە ئەو کەسەی مەی گێڕە و تێی دەکات، ئەو کەسەی دەیفرۆشێت، ئەوەی نرخ و بەهاکەی دەخوات، ئەو کەسەی دەیکڕێت، ئەو کەسەی بۆی دەکڕن).

## دەربارەی دۆشینی ئاژەڵان بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکانیان

## ٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي احْتِلاَبِ الْمَوَاشِي بِغَيْرِ إِذْنِ الأَرْبَابِ

١٢٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ عَلَى مَاشِيَةٍ، فَإِنْ كَانَ فِيهَا صَاحِبُهَا فَلْيَسْتَأْذِنْهُ، فَإِنْ أَذِنَ لَهُ فَلْيَحْتَلِبْ وَلْيَشْرَبْ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا أَحَدٌ فَلْيُصَوِّتْ ثَلاَثًا، فَإِنْ أَجَابَهُ أَحَدٌ فَلْيَسْتَأْذِنْهُ، فَإِنْ لَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ فَلْيَحْتَلِبْ وَلْيَشْرَبْ، وَلاَ يَحْمِلْ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَأَبِي سَعِيدٍ. حَدِيثُ سَمُرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: سَمَاعُ الحَسَنِ مِنْ سَمُرَةَ صَحِيحٌ وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ فِي رِوَايَةِ الحَسَنِ عَنْ سَمُرَةَ، وَقَالُوا: إِنَّمَا يُحَدِّثُ عَنْ صَحِيفَةِ سَمُرَةَ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ کەسێ لەئێوە چوە ناو مەڕ و ماڵاتێکەوە: ئەگەر خاوەنەکەی لەوێ بوو با مۆڵەتی لێ بخوازێت، ئەگەر ڕێی دا با بیدۆشێت و بیخواتەوە، ئەگەر لەوێش نەبوو با سێ جار بانگی خاوەن ماڵەکە بکات، ئەگەر وەڵامی دایەوە داوای مۆڵەتی لێ بکات، ئەگەر کەس وەڵامی نەدایەوە ئەوە با بیدۆشێت و بیخواتەوە بەڵام هەڵی نەگرێت واتە ئەوەندەی کە پێویستی بێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فرۆشتنی بت و پێستی مردارەوە بوو

## ٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعِ جُلُودِ الْمَيْتَةِ وَالأَصْنَامِ

١٢٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الخَمْرِ، وَالمَيْتَةِ، وَالخِنْزِيرِ، وَالأَصْنَامِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ، فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ، قَالَ: لاَ هُوَ حَرَامٌ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ ذَلِكَ: قَاتَلَ اللَّهُ اليَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ فَأَجْمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ساڵی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا گوێ لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بێگومان خوای گەورە فرۆشتنی شەراب و، گۆشتی مردارەوەبوو، گۆشتی بەراز و بتەکانی حەرمکردوە). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێت چۆنە ئەگەر بە بەزی مردارەوەبوو کەشتیەکانی پێ چەور بکرێت و پێستەکانی پێ چەور بکرێت و بکرێتە چراوەو خەڵك سودی لێ ببینن بۆ ڕوناکی؟ فەرمووی: (نابێ حەرامە) لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە جولەکە لەناوبات! لەکاتێکدا کە خوای گەورە بەزی مردارەوەبووی لێ حەرام کردن ئەوان تاواندیانەوەو کردیان بە ڕۆن لەپاشدا فرۆشتیان و پارەکەیان خوارد).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەشیمان بوونەوە لە خەڵات و دیاری

٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّجُوعِ فِي الهِبَ

١٢٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السُّوءِ العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئێمەی موسوڵمان ناکرێ خاوەنی ڕەوشت و سیفاتی ناشیرین بین، ئەو کەسەی لە دیاری و خەڵاتەکەی پەشیمان بێتەوە وەکو ئەو سەگە وایە کە بڕشێتەوەو سەرلەنوێ ڕشانەوەکەی خۆی بخواتەوە).

لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ کەسێ ڕەوا نیە لە دیاری و خەڵاتەکەی پەشیمان بێتەوە جگە لە باوك کە ببەخشێ بە کوڕەکەی ئەوە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە).

١٢٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، أَنَّهُ سَمِعَ طَاوُوسًا يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ يَرْفَعَانِ الحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهَذَا الحَدِيثِ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: مَنْ وَهَبَ هِبَةً لِذِي رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيهَا، وَمَنْ وَهَبَ هِبَةً لِغَيْرِ ذِي رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَلَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيهَا، مَا لَمْ يُثَبْ مِنْهَا. وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الوَالِدَ

فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ وَاحْتَجَّ الشَّافِعِيُّ بِحَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە لای هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و جگە لەوانیش دەفەرموون: کەسێ خەڵات و دیاریەکی بەخشی بە یەکێ لە خزمە مەحرەمەکانی بۆی نیە پەشیمان بێتەوە، بەڵام کەسێ دیاریەکی بەخشی بە یەکێ لە خزمە نامەحرەمەکانی بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە، بەمەرجێ پاداشتی لەسەر وەرنەگرتبێ. ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (ثوري)ە. پێشەوا شافیعی دەفەرمووێ: بۆ هیچ کەسێ ڕەوا نیە لە خەڵات و دیاریەکەی پەشیمان بێتەوە جگە لە باوك بۆ کوڕەکەی. پێشەوا شافیعی فەرموودەکەی ئیبنو عومەری کردووە بە بەڵگە، لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ کەسێ ڕەوا نیە لە دیاری و خەڵاتەکەی پەشیمان بێتەوە جگە لە باوك کە بیبەخشێ بە کوڕەکەی ئەوە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی (عرايا) و ڕێگەپێدانی

## ٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْعَرَايَا وَالرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

١٣٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ أَذِنَ لأَهْلِ الْعَرَايَا أَنْ يَبِيعُوهَا بِمِثْلِ خَرْصِهَا. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ هَكَذَا رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ هَذَا الْحَدِيثَ، وَرَوَى أَيُّوبُ، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ، عَنِ ابْنِ

عُمَرَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ رَخَّصَ فِي العَرَايَا وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە زەیدی كوڕی (ثابت)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەری دارخورما بە دارەوە بخەملێنرێ و بفرۆشرێ بە خورمای وشك، وە بەرسیلەی ترێ بە دارەوە بخەملێنرێ و بفرۆشرێ بە مێوژ، هەروەها نەهی كردووە لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی بە خواردەمەنی، ئەوەندە هەیە رێگەی داوە بە پێڕی (عَرَايَا) هەژارانی بێ باخە خورما بە خەملاندن. هەروەها لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم نەهی كردوە لە فرۆشتنی بەری دارخورما بە دارەوە بخەملێنرێ بفرۆشرێ بە خورمای وشك، وە بەرسیلەی ترێ بە دارەوە بخەملێنرێ و بفرۆشرێ بە مێوژ، هەروەها نەهی كردووە لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی.

١٣٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، مَوْلَى ابْنِ أَبِي أَحْمَدَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ فِي بَيْعِ العَرَايَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ كَذَا. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ حُصَيْنٍ نَحْوَهُ. وَرُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْخَصَ فِي بَيْعِ العَرَايَا فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، أَوْ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رێگەی داوە بە مامەڵەی (عَرَايَا) بە مەرجێ پێنج ویسق یان كەمتر بێ.

١٣٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْخَصَ فِي بَيْعِ العَرَايَا بِخَرْصِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالُوا: إِنَّ العَرَايَا مُسْتَثْنَاةٌ مِنْ جُمْلَةِ نَهْيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالمُزَابَنَةِ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَحَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَقَالُوا: لَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ مَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ وَمَعْنَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرَادَ التَّوْسِعَةَ عَلَيْهِمْ فِي هَذَا لأَنَّهُمْ شَكَوْا إِلَيْهِ، وَقَالُوا: لاَ نَجِدُ مَا نَشْتَرِي مِنَ التَّمْرِ إِلاَّ بِالتَّمْرِ، فَرَخَّصَ لَهُمْ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَنْ يَشْتَرُوهَا فَيَأْكُلُوهَا رُطَبًا.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگەی داوە بە مامەڵەی (عَرَايَا) بەسەر دارەکەوە بخەملێنرێت.

## باسێکی تر لەوبارەوە

٦٤ - بَابٌ مِنْه

١٣٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الحُلْوَانِيُّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ، مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ، أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ، وَسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ، حَدَّثَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْمُزَابَنَةِ التَّمَرِ بِالتَّمْرِ، إِلاَّ لأَصْحَابِ العَرَايَا، فَإِنَّهُ قَدْ أَذِنَ لَهُمْ، وَعَنْ بَيْعِ العِنَبِ بِالزَّبِيبِ، وَعَنْ كُلِّ ثَمَرٍ بِخَرْصِهِ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی ئەبو (حثمة)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی شیناییی بە نەدووراوەیی

بەرووبووم بە خورما، جگە لە پێری (عَرَايَا)، لەبەرئەوەی رێگەی داوە بەوان، هەروەها نەهی كردووە لە فرۆشتنی ترێ بە مێوژ، وە لە هەموو بەرووبوومێ بە دارەوە بخەملێنرێ.

## دەربارەی قەدەغەكردنی زیادكردنی نرخ بۆ فێڵ كردن

٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّجْشِ فِي البُيُوعِ

١٣٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَقَالَ قُتَيْبَةُ: يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَنَاجَشُوا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا النَّجْشَ. وَالنَّجْشُ: أَنْ يَأْتِيَ الرَّجُلُ الَّذِي يَفْصِلُ السِّلْعَةَ إِلَى صَاحِبِ السِّلْعَةِ فَيَسْتَامُ بِأَكْثَرَ مِمَّا تَسْوَى، وَذَلِكَ عِنْدَمَا يَحْضُرُهُ الْمُشْتَرِي يُرِيدُ أَنْ يَغْتَرَّ الْمُشْتَرِي بِهِ، وَلَيْسَ مِنْ رَأْيِهِ الشِّرَاءُ إِنَّمَا يُرِيدُ أَنْ يَخْدَعَ الْمُشْتَرِيَ بِمَا يَسْتَامُ. وَهَذَا ضَرْبٌ مِنَ الخَدِيعَةِ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَإِنْ نَجَشَ رَجُلٌ، فَالنَّاجِشُ آثِمٌ فِيمَا يَصْنَعُ، وَالبَيْعُ جَائِزٌ، لأَنَّ البَائِعَ غَيْرُ النَّاجِشِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زەمی درۆ مەكەن بۆ خەڵەتاندن و تەفرەدانی كڕیار واتە نرخ لەسەر شت زیاد مەكەن بۆ فێڵ كردن لە كڕیارو خەڵەتاندنی لەكاتێكدا كە خۆشتان نەیكڕن بەو نرخە).

## سەبارەت بە سەنگینی كێشانەو كێشانە بەكرێ.

٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّجْحَانِ فِي الوَزْنِ

١٣٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَمَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ، فَجَاءَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ، وَعِنْدِي وَزَّانٌ يَزِنُ بِالأُجْرَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْوَزَّانِ: زِنْ وَأَرْجِحْ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ سُوَيْدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَهْلُ العِلْمِ يَسْتَحِبُّونَ الرُّجْحَانَ فِي الوَزْنِ. وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ سِمَاكٍ، فَقَالَ: عَنْ أَبِي صَفْوَانَ وَذَكَرَ الحَدِيثَ.

واتە: لە سوەیدی كوڕی قەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: من و مەخرەفەی عەبدی لە هەجەرەوە قوماشمان هێنا بوو، بردمان بۆ مەككە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆلامان سەودای شەروالێكی كرد پێمان فرۆشت، پیاوێكم بەكرێ گرتبوو شتی دەكێشا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بیكێشەو سەنگین بیكێشە).

## مۆڵەتدانی قەرزاری نەدارا و نەرم و نیانی لەتەكی

٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِنْظَارِ الْمُعْسِرِ وَالرِّفْقِ بِهِ

١٣٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سُلَيْمَانَ الرَّازِيُّ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا، أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي اليَسَرِ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَحُذَيْفَةَ، وَابْنِ

مَسْعُودٍ، وَعُبَادَةَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ مۆڵەتی قەرزاری نەدارا بدات یان کاری بۆ ئاسان بکات لە قەرزەکە بۆی دابشکێنێ، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خۆیدا دایدەنێ، لەرۆژێکدا جگە لەو سێبەرە هیچ سێبەرێکی تر نیە).

١٣٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حُوسِبَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مِنَ الخَيْرِ شَيْءٌ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ رَجُلاً مُوسِرًا، وَكَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَكَانَ يَأْمُرُ غِلْمَانَهُ أَنْ يَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُعْسِرِ، فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ، تَجَاوَزُوا عَنْهُ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو اليَسَرِ، كَعْبُ بْنُ عَمْرٍو.

واتە: لە ئەبی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاوێك لە گەلانی پێش ئێوە بوو لێپێچینەوەی لەگەڵدا کرا هیچ کردەوەیەکی چاکەی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ پیاوێکی دەوڵەمەند بوو سەوداو مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد، فەرمانی بە پیاوەکانی دەکرد کە چاوپۆشی بکەن لە قەرزاری نەدارا، خوای گەورە فەرمووی: (ئێمە لەپێشترین چاوپۆشی لە خەڵك بکەین، ئێوەش چاوپۆشی لێ بکەن و نەرم بن لەگەڵی).

## دواخستنی قەرز بەبێ بەهانە زوڵم و ستەمە

### ٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَطْلِ الغَنِيِّ أَنَّهُ ظُلْمٌ

١٣٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَالشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كەسێ قەرزی كەسێكی بەلاوە بێت، دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوەو نەیداتەوە ئەوە زوڵم و ستەمە، هەركاتێ یەكێ لەئێوە ڕەوانەی لای كەسێكی دارا واتە دەوڵەمەند كرا با بچێت).

١٣٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الهَرَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُحِلْتَ عَلَى مَلِيءٍ فَاتْبَعْهُ، وَلاَ تَبِعْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَمَعْنَاهُ إِذَا أُحِيلَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا أُحِيلَ الرَّجُلُ عَلَى مَلِيٍّ فَاحْتَالَهُ فَقَدْ بَرِئَ الْمُحِيلُ، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَرْجِعَ عَلَى الْمُحِيلِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا تَوِيَ مَالُ هَذَا بِإِفْلاَسِ الْمُحَالِ عَلَيْهِ فَلَهُ أَنْ يَرْجِعَ عَلَى الأَوَّلِ وَاحْتَجُّوا بِقَوْلِ عُثْمَانَ، وَغَيْرِهِ، حِينَ قَالُوا: لَيْسَ عَلَى مَالِ مُسْلِمٍ تَوًى. قَالَ إِسْحَاقُ: مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ لَيْسَ عَلَى مَالِ مُسْلِمٍ تَوِيَ هَذَا إِذَا أُحِيلَ الرَّجُلُ عَلَى آخَرَ وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ مَلِيٌّ، فَإِذَا هُوَ مُعْدِمٌ فَلَيْسَ عَلَى مَالِ مُسْلِمٍ تَوًى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كەسێ قەرزی كەسێكی بەلاوە بێت، دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوەو نەیداتەوە ئەوە زوڵم و ستەمە، هەركاتێ یەكێ لەئێوە رەوانەی لای كەسێكی دارا واتە دەوڵەمەند كرا با بچێت، دوو فرۆشتن لە فرۆشتنێكدا مەكە).

ئەوەی هاتووە دەربارەی (ملامسة) و (منابذة).

٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُلاَمَسَةِ وَالمنَابَذَةِ

١٣١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الْمُنَابَذَةِ وَالملاَمَسَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنْ يَقُولَ إِذَا نَبَذْتُ إِلَيْكَ الشَّيْءَ فَقَدْ وَجَبَ البَيْعُ بَيْنِي وَبَيْنَكَ. وَالملاَمَسَةُ: أَنْ يَقُولَ إِذَا لَمَسْتَ الشَّيْءَ فَقَدْ وَجَبَ البَيْعُ، وَإِنْ كَانَ لاَ يَرَى مِنْهُ شَيْئًا مِثْلَ مَا يَكُونُ فِي الجِرَابِ، أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ، وَإِنَّمَا كَانَ هَذَا مِنْ بُيُوعِ أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردووە لە (ملامسة) و (منابذة). (ملامسة): بریتیە لەوەی پیاو دەست بدات لە قوماشی كەسێكی تر ئیتر بەشەو بێ یان بە رۆژ ئەوكاتە فرۆشتنەكە واجب ببێ. (منابذة): بریتیە لەوەی پیاو كاڵا یان پۆشاكەكەی هەڵدا بۆ كەسێكی تر ئەویش بە هەمان شێوە كاڵا یان پۆشاكەكەی هەڵدا بۆ ئەو بەبێ رەزامەندی نواندن ئەوە مامەڵەیان بێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەلەم لە خۆراك و خورمادا

٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّلَفِ فِي الطَّعَامِ وَالتَّمْرِ

١٣١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي التَّمْرِ، فَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَجَازُوا السَّلَفَ فِي الطَّعَامِ وَالثِّيَابِ وَغَيْرِ ذَلِكَ مِمَّا يُعْرَفُ حَدُّهُ وَصِفَتُهُ، وَاخْتَلَفُوا فِي السَّلَمِ فِي الحَيَوَانِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمُ السَّلَمَ فِي الحَيَوَانِ جَائِزًا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمُ السَّلَمَ فِي الحَيَوَانِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ. أَبُو الْمِنْهَالِ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُطْعِمٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كۆچی كرد بۆ شاری مەدینە خەڵكی مەدینە ساڵ و دوو ساڵ و سێ ساڵ خورمایان سەلەم دەكرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەركەس سەلەم دەكات با كێشانە و پێوانەو ماوەو وادەكەی دیاریكراو بێت).

## دەربارەی زەوی شەراکەت یەکێکیان بیەوێ بەشی خۆی بفرۆشێ

٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَرْضِ الْمُشْتَرَكِ يُرِيدُ بَعْضُهُمْ بَيْعَ نَصِيبِهِ

١٣١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ الْيَشْكُرِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ شَرِيكٌ فِي حَائِطٍ فَلاَ يَبِيعُ نَصِيبَهُ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى يَعْرِضَهُ عَلَى شَرِيكِهِ. هَذَا حَدِيثٌ إِسْنَادُهُ لَيْسَ بِمُتَّصِلٍ سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: سُلَيْمَانُ الْيَشْكُرِيُّ يُقَالُ إِنَّهُ مَاتَ فِي حَيَاةِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. قَالَ: وَلَمْ يَسْمَعْ مِنْهُ قَتَادَةُ، وَلاَ أَبُو بِشْرٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلاَ نَعْرِفُ لأَحَدٍ مِنْهُمْ سَمَاعًا مِنْ سُلَيْمَانَ الْيَشْكُرِيِّ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ فَلَعَلَّهُ سَمِعَ مِنْهُ فِي حَيَاةِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَإِنَّمَا يُحَدِّثُ قَتَادَةُ عَنْ صَحِيفَةِ سُلَيْمَانَ الْيَشْكُرِيِّ وَكَانَ لَهُ كِتَابٌ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الْعَطَّارُ عَبْدُ الْقُدُّوسِ قَالَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: قَالَ سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ: ذَهَبُوا بِصَحِيفَةِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ إِلَى الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ فَأَخَذَهَا، أَوْ قَالَ فَرَوَاهَا، وَذَهَبُوا بِهَا إِلَى قَتَادَةَ فَرَوَاهَا، وَأَتَوْنِي بِهَا فَلَمْ أَرْوِهَا، يَقُولُ: رَدَدْتُهَا.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك شەریکێکی هەبوو لە باخ و باخات - و خانوبەرەو دوکان و زەوی - دا ئەوە دروست نیە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت هەتا پرس نەکات بە شەریکەکەی و ئاگاداری نەکاتەوەو مۆڵەتی لێ وەرنەگرێ، جا ئەگەر فرۆشتی ئەوا شەریکەکەی شایستەترە بە هەڵگرتنەوەی ئەگەر بیەوێ).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی (مخابرة) و (معاومة).**

٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُخَابَرَةِ وَالمعَاوَمَةِ

١٣١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالمزَابَنَةِ، وَالمخَابَرَةِ، وَالمعَاوَمَةِ، وَرَخَّصَ فِي العَرَايَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە فرۆشتنی شینایی بە نەدووراوەیی و لە فرۆشتنی بەری خورماو بەرسیلەی ترێ بە دارەوەو، لە کشتوکاڵ کردن لەزەویەکدا تۆوەکە لەسەر کرێکار بێت، هەروەها لە فرۆشتنی بەری درەخت بۆ ماوەی چەند ساڵێ، وە ڕێگەی عەرایای داوە. - پێشتر ڕاڤەی عەرایا کراوە -.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی نرخ دانان لەسەر شت**

٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْعِيرِ

١٣١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، وَثَابِتٌ، وَحُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: غَلاَ السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، سَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ، القَابِضُ، البَاسِطُ، الرَّزَّاقُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى رَبِّي وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَطْلُبُنِي بِمَظْلِمَةٍ فِي دَمٍ وَلاَ مَالٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نرخی نرخی کەل

و پەل و کالاّو شمەك گران بوو، خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، نرخی شتەکان دابنێ بۆمان، فەرمووی: (خوای پەروەردگار خۆی نرخ دانەرە، ڕۆزی دەرە، هەرخۆی ڕۆزی و هەموو شتێ دەگرێتەوەو گوشادیشی دەکات، ئومێد دەکەم هەتا دەگەمەوە بە خوای گەورە هیچ کەسێ لەئێوە داواچی نەبێ لەسەرم داوای هەقی خۆیم لێ بکات ئیتر ئەو هەقە خوێن بێت یان ماڵ و سامان).

## سەبارەت بە نەهی کردن لە غەل و غەش.

٧٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الغِشِّ فِي البُيُوعِ

١٣١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى صُبْرَةٍ مِنْ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ، مَا هَذَا؟، قَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ حَتَّى يَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي الحَمْرَاءِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَبُرَيْدَةَ، وَأَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا الغِشَّ، وَقَالُوا: الغِشُّ حَرَامٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای پیاوێکدا خۆراکی دەفرۆشت، دەستی کرد بەناو خواردنەکەدا پەنجەکانی تەڕ بوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی خاوەن خۆراك ئەمە چییە؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە باران لێی داوە، فەرمووی: (ئەی بۆ لەسەری خۆراکەکەوە داتنەناوە هەتا خەڵك بیبینێت؟) لەپاشدا فەرمووی: (هەرکەسێ غەل و غەش بکات لەسەر

بەرنامەو ڕێبازی ئێمە نیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قەرزکردنی ئاژەڵ ولآخی سواری

٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِقْرَاضِ البَعِيرِ أَوِ الشَّيْءِ مِنَ الحَيَوَانِ أَوِ السِّنِّ

١٣١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اسْتَقْرَضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِنًّا، فَأَعْطَاهُ سِنًّا خَيْرًا مِنْ سِنِّهِ، وَقَالَ: خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ قَضَاءً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي رَافِعٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَسُفْيَانُ، عَنْ سَلَمَةَ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ لَمْ يَرَوْا بِاسْتِقْرَاضِ السِّنِّ بَأْسًا مِنَ الإِبِلِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَكَرِهَ بَعْضُهُمْ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵێکی لە پیاوێ، لەپاشدا ئاژەڵێکی چاکتری دایەوە، فەرمووی: (چاکترین کەستان ئەو کەسەیە کە قەرز بە چاکی دەداتەوە).

١٣١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَجُلاً تَقَاضَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَغْلَظَ لَهُ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الحَقِّ مَقَالاً، ثُمَّ قَالَ: اشْتَرُوا لَهُ بَعِيرًا، فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَطَلَبُوهُ، فَلَمْ يَجِدُوا إِلاَّ سِنًّا أَفْضَلَ مِنْ سِنِّهِ، فَقَالَ: اشْتَرُوهُ، فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خَيْرَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵی پیاوێکی بە قەرز لەلا بوو، کابرا داوای قەرزەکەی کردەوە قسەی رەق بوو، هاوەڵان بە نیازبوون لێی بدەن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وازی لێ بێنن، چونکە خاوەن هەق مافی خۆیەتی قسە بکات)، لەپاشدا فەرمووی: (ئاژەڵێکی بۆ بکڕن و بیدەنێ)، گەڕان دەستیان نەکەوت جگە لە ئاژەڵێکی چاکتر نەبێ، فەرمووی: (بۆی بکڕن و بیدەنێ، چونکە چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قەرز بە جوانی دەداتەوە).

١٣١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا، فَجَاءَتْهُ إِبِلٌ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ أَبُو رَافِعٍ: فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ، فَقُلْتُ: لاَ أَجِدُ فِي الإِبِلِ إِلاَّ جَمَلاً خِيَارًا رَبَاعِيًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو رافیعەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵی تازەپێگەیشتوی لە پیاوێ قەرز کردبوو، کاتێ ئاژەڵی زەکاتی بۆ هات، ئەبو رافیع رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردم قەرزی کابرا بدەمەوە، وتم: تەنیا ئاژەڵێکی چاکی پێگەیشتوومان هەیە لەوەی خۆی چاکترە، فەرمووی: (بیدەرێ، چونکە چاکترینی خەڵك ئەو کەسەیە کە قەرز بە جوانی دەداتەوە).

١٣١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سُلَيْمَانَ الرَّازِيُّ، عَنْ مُغِيرَةَ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ سَمْحَ البَيْعِ، سَمْحَ الشِّرَاءِ، سَمْحَ القَضَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ يُونُسَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لێ بوردەیی و ئاسانکاری لە سەوداو مامەڵە و قەرزدانەوەدا پێ خۆشە).

١٣٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: غَفَرَ اللَّهُ لِرَجُلٍ كَانَ قَبْلَكُمْ، كَانَ سَهْلاً إِذَا بَاعَ، سَهْلاً إِذَا اشْتَرَى، سَهْلاً إِذَا اقْتَضَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لە پیاوێکی گەلانی پێش ئێوە خۆش بوو لەبەرئەوەی سەوداو مامەڵە و قەرزدانەوەی ئاسانکاری بوو بە نەرمی بە جوانی ئەو کارانەی ئەنجام دەدا).

### قەدەغەکردنی سەوداو مامەڵە لە مزگەوتدا

### ٧٦ - بَابُ النَّهْيِ عَنِ البَيْعِ فِي الْمَسْجِدِ

١٣٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَارِمٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ خُصَيْفَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً،

فَقُولُوا: لاَ رَدَّ اللَّهُ عَلَيْكَ.حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا البَيْعَ وَالشِّرَاءَ فِي الْمَسْجِدِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ رَخَّصَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي البَيْعِ وَالشِّرَاءِ فِي الْمَسْجِدِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان دی لە مزگەوتدا سەوداو مامەڵەی دەکرد، بڵێن: خوای گەورە بەرەکەت نەخاتە بازرگانیەکەتەوەو قازانجی لێ نەکەیت، ئەگەر کەسێکتان دی لە مزگەوتدا بانگەوازی دەکرد بۆ شتی ونبوو، بڵێن: (خوای گەورە بۆت نەگێرێتەوە و نەیدۆزیتەوە).

فَقُولُوا: لاَ رَدَّ اللَّهُ عَلَيْكَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ كَرِهُوا البَيْعَ وَالشِّرَاءَ فِي الْمَسْجِدِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ رَخَّصَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي البَيْعِ وَالشِّرَاءِ فِي الْمَسْجِدِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان دی لە مزگەوتدا سەوداو مامەڵەی دەکرد، بڵێن: خوای گەورە بەرەکەت نەخاتە بازرگانیەکەتەوەو قازانجی لێ نەکەیت، ئەگەر کەسێکتان دی لە مزگەوتدا بانگەوازی دەکرد بۆ شتی ونبوو، بڵێن: (خوای گەورە بۆت نەگێڕێتەوە و نەیدۆزیتەوە).

# پەرتوکی ئەحکامەکان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ١٣ – أَبْوَابُ الأَحْكَامِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەربارەی قازی

١ – بَابُ مَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي القَاضِي

١٣٢٢ – **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الْمَلِكِ يُحَدِّثُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، أَنَّ عُثْمَانَ قَالَ لِابْنِ عُمَرَ: اذْهَبْ فَاقْضِ بَيْنَ النَّاسِ، قَالَ: أَوَ تُعَافِينِي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَالَ: فَمَا تَكْرَهُ مِنْ ذَلِكَ، وَقَدْ كَانَ أَبُوكَ يَقْضِي؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ قَاضِيًا فَقَضَى بِالعَدْلِ فَبِالحَرِيِّ أَنْ يَنْقَلِبَ مِنْهُ كَفَافًا. فَمَا أَرْجُو بَعْدَ ذَلِكَ؟ وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ عِنْدِي بِمُتَّصِلٍ وَعَبْدُ الْمَلِكِ الَّذِي رَوَى عَنْهُ الْمُعْتَمِرُ هَذَا، هُوَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي جَمِيلَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەوهەبەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوایان لێ بێ بە ئیبنو عومەری فەرموو: بڕۆ لەنێوان خەڵکدا دادوەری بکە، فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە بەزەییت دێتەوە پێمدا، فەرمووی: ئەوە بۆ پێت ناخۆشە، بێگومان باوکت قازی بوو دادوەری دەکرد؟ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەس دادوەری کرد با دادپەروارانە بیکات، شایستەی ئەوەیە بەبێ ئارەق دەرچێ). ئیتر لەدوای بیستنی ئەم فەرموودە ئاوات بۆ چی بخوازم.

١٣٢٢م- (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي الحَسَنُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: القُضَاةُ ثَلاَثَةٌ: قَاضِيَانِ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ فِي الجَنَّةِ، رَجُلٌ قَضَى بِغَيْرِ الحَقِّ فَعَلِمَ ذَاكَ فَذَاكَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ لاَ يَعْلَمُ فَأَهْلَكَ حُقُوقَ النَّاسِ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ قَضَى بِالحَقِّ فَذَلِكَ فِي الجَنَّةِ.

واتە: لە بوورەیدەوە، لەباوکیەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (قازیەکان سیانن: دووانیان لە ئاگری دۆزەخدان، یەکێکیان لە بەهەشتدایە، ئەوەی لە ئاگری دۆزەخدایە ئەوەیە کە زانیویەتی کامە هەقەو زوڵم و ستەمی تێدا کردوەو بەوشێوەیە حوکمی نەکردوە، ئەو قازیەش کە بە نەزانین حوکمی کردوە لەنێوان خەڵکدا مافی خەڵکی پێشێل کردووە ئەوە لەئاگری دۆزەخدایە، ئەوەشیان کە لە بەهەشتدایە ئەوەیە کە زانیویەتی کامە هەقەو بەوشێوەیە حوکمی کردوە).

١٣٢٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ بِلاَلِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَأَلَ القَضَاءَ وُكِلَ إِلَى نَفْسِهِ، وَمَنْ أُجْبِرَ عَلَيْهِ يُنْزِلُ اللَّهُ عَلَيْهِ مَلَكًا فَيُسَدِّدُهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسیٚ هەوڵ بدات بۆ دادوەری و خۆی داوای بکات ئەوە دەدرێتە دەستی خۆی پشتیوانی ناکرێت و خوای گەورە یارمەتی نادات، هەرکەس داوای نەکات و زۆری لیٚ بکەن خوای گەورە مەلائیکەیەکی بۆ دادەبەزێنیٚ راستی نیشان دەدات و رێنمایی دەکات).

١٣٢٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، عَنْ أَبِي عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى الثَّعْلَبِيِّ، عَنْ بِلاَلِ بْنِ مِرْدَاسٍ الفَزَارِيِّ، عَنْ خَيْثَمَةَ وَهُوَ البَصْرِيُّ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنِ ابْتَغَى القَضَاءَ وَسَأَلَ فِيهِ شُفَعَاءَ وُكِلَ إِلَى نَفْسِهِ، وَمَنْ أُكْرِهَ عَلَيْهِ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ مَلَكًا يُسَدِّدُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ هەوڵ بدات بۆ دادوەری و خۆی داوای بکات بە تکای تکاکار بەدەستی بێنێ ئەوە دەدرێتە دەستی خۆی پشتیوانی ناکرێت و خوای گەورە یارمەتی نادات، هەرکەس داوای نەکات و بە تکای تکاکار بەدەستی نەهێنێ خوای گەورە مەلائیکەیەکی بۆ دادەبەزێنێ راستی نیشان دەدات و رێنمایی دەکات).

١٣٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ وَلِيَ القَضَاءَ، أَوْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ رُوِيَ أَيْضًا مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس کرایە دادوەر(قازی) و دادوەری کرد لەنێوان خەڵکدا، وەك ئەوە وایە بەبێ چەقۆ سەربڕدرێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دادوەر ئەپێکێ و ناپێکێ

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَاضِي يُصِيبُ وَيُخْطِئُ

١٣٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَأَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ وَاحِدٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ عَنْ مَعْمَرٍ عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر حاکم حوکمێکی دەرکرد بە ئیجتیهادی خۆی هەوڵی پێکانی هەقی داو هەقی پێکا ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەقی نەپێکا ئەوە یەك پاداشتی بۆ هەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دادوەر چۆن حوکم بکات

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَاضِي كَيْفَ يَقْضِي

١٣٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي عَوْنٍ الثَّقَفِيِّ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ رِجَالٍ مِنْ أَصْحَابِ مُعَاذٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى اليَمَنِ، فَقَالَ: كَيْفَ تَقْضِي؟، فَقَالَ: أَقْضِي بِمَا فِي كِتَابِ اللهِ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللهِ؟، قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟، قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي، قَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللهِ.

واتە: لە (حارث)ی کوڕی عەمرەوە، لە چەند کەسانێك لە هاوڕێیانی (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (معاذ)ی ڕەوانە کرد بۆ یەمەن بۆ ئەوەی ببێتە قازی و کاربەدەستیان، فەرمووی: (ئەگەر دادوەری هاتەپێش چۆن دادوەری دەکەیت؟). وتی: بە کتێبەکەی خوای گەورە واتە بە قورئان حوکم دەکەم، فەرمووی: (ئەگەر لە قورئاندا وەڵامت دەست نەکەوت؟). وتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حوکم دەکەم، فەرمووی: (ئەگەر لە سوننەتدا وەڵامت دەست نەکەوت؟). وتی: بە ئیجتیهادی خۆم ئەوپەڕی توانای خۆم دەخەمەگەڕ و هەوڵ دەدەم و کۆشش دەکەم بۆ دۆزینەوەی هەق، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوپاس بۆ خوای گەورە کە نێرراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتو کرد).

١٣٢٨ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي عَوْنٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ عَمْرٍو ابْنِ أَخٍ لِلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أُنَاسٍ مِنْ أَهْلِ حِمْصٍ، عَنْ مُعَاذٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ عِنْدِي بِمُتَّصِلٍ وَأَبُو عَوْنٍ الثَّقَفِيُّ اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوای دادپەروەر

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِمَامِ العَادِلِ

١٣٢٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُنْذِرِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ مَرْزُوقٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَى اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ وَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَامٌ عَادِلٌ، وَأَبْغَضَ

النَّاسِ إِلَى اللهِ وَأَبْعَدَهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَامٌ جَائِرٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا خۆشەویستترین کەس و نزیکترین کەس لەڕووی پلەو پایەوە لای خوای گەورە کاربەدەست و پێشەوای دادپەروەرە، وە بێزراوترین کەس و دوورترین کەسیش لەڕووی پلەو پایەوە لای خوای گەورە کاربەدەست و پێشەوای زاڵم و ستەمکارە).

١٣٣٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ أَبُو بَكْرٍ العَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللهَ مَعَ القَاضِي مَا لَمْ يَجُرْ، فَإِذَا جَارَ تَخَلَّى عَنْهُ وَلَزِمَهُ الشَّيْطَانُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ القَطَّانِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە یارمەتی دادوەر دەدات و پشتیوانی لێ دەکات هەتا ناڕەوایی و زوڵم و ستەم نەکات، بەڵام کاتێ ناڕەوایی و زوڵم و ستەمی کرد شەیتان دەیگرێتە ئەستۆی خۆی).

## دادوەر نابێ دادوەری بکات هەتا گوێ لە قسەی خاوەن کێشەکان نەگرێ

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَاضِي لاَ يَقْضِي بَيْنَ الخَصْمَيْنِ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَهُمَا

١٣٣١ - (حسن) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ حَنَشٍ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا تَقَاضَى إِلَيْكَ رَجُلاَنِ، فَلاَ تَقْضِ لِلأَوَّلِ حَتَّى تَسْمَعَ كَلاَمَ الآخَرِ، فَسَوْفَ تَدْرِي كَيْفَ تَقْضِي. قَالَ عَلِيٌّ: فَمَا زِلْتُ قَاضِيًا بَعْدُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەگەر دوو کەس بۆ دادگایی هاتن بۆ لای تۆ، لەسەر قسەی یەکەم بڕیار مەدە هەتا گوێ لەوی تریشیان نەگریت، ئەگەر گوێت لەوی تریشیان گرت ئەو کاتە باشتر دەزانی چۆن بڕیار بدەیت). پێشەوا عەلی فەرمووی: لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێنمایی کردم ئیتر بەردەوام بە چاکی دادوەریم دەکرد لەنێوان خەڵکدا.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوای خەڵك

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِمَامِ الرَّعِيَّةِ

١٣٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ الحَكَمِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الحَسَنِ، قَالَ: قَالَ عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ لِمُعَاوِيَةَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ إِمَامٍ يُغْلِقُ بَابَهُ دُونَ ذَوِي الحَاجَةِ، وَالخَلَّةِ، وَالمَسْكَنَةِ إِلاَّ أَغْلَقَ اللَّهُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ دُونَ خَلَّتِهِ، وَحَاجَتِهِ، وَمَسْكَنَتِهِ، فَجَعَلَ مُعَاوِيَةُ رَجُلاً عَلَى حَوَائِجِ النَّاسِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: حَدِيثُ عَمْرِو بْنِ

## کاتێ موڵك بەشكراو سنوری بۆ دیاریکرا مافی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا حُدَّتِ الحُدُودُ وَوَقَعَتِ السِّهَامُ فَلاَ شُفْعَةَ

١٣٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا وَقَعَتِ الحُدُودُ، وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ، فَلاَ شُفْعَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ مُرْسَلاً، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَبِهِ يَقُولُ بَعْضُ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ، مِثْلَ: عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ، وَغَيْرِهِ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، مِنْهُمْ: يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، وَرَبِيعَةُ بْنُ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: لاَ يَرَوْنَ الشُّفْعَةَ إِلاَّ لِلْخَلِيطِ، وَلاَ يَرَوْنَ لِلْجَارِ شُفْعَةً إِذَا لَمْ يَكُنْ خَلِيطًا. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: الشُّفْعَةُ لِلْجَارِ، وَاحْتَجُّوا بِالحَدِيثِ الْمَرْفُوعِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِالدَّارِ، وَقَالَ: الجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ موڵك بەشكراو سنوریان دیاریکراو جیاکرایەوەو ڕێگاکانی چونە ناوی گۆڕرا ئیتر مافی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی هاوبەش شەفیعە**

٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الشَّرِيكَ شَفِيعٌ

١٣٧١ - (منكر) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ السُّكَّرِيِّ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الشَّرِيكُ شَفِيعٌ، وَالشُّفْعَةُ فِي كُلِّ شَيْءٍ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي حَمْزَةَ السُّكَّرِيِّ وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَهَذَا أَصَحُّ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، وَلَيْسَ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ مِثْلَ هَذَا لَيْسَ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي حَمْزَةَ، وَأَبُو حَمْزَةَ ثِقَةٌ يُمْكِنُ أَنْ يَكُونَ الخَطَأُ مِنْ غَيْرِ أَبِي حَمْزَةَ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ. وَقَالَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنَّمَا تَكُونُ الشُّفْعَةُ فِي الدُّورِ وَالأَرَضِينَ، وَلَمْ يَرَوْا الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ شَيْءٍ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: الشُّفْعَةُ فِي كُلِّ شَيْءٍ. وَالأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هاوبەش شەفیعە، شوفعە لەهەموو شتێکدا هەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شتی دۆزراوە و ئاژەڵی ون بوو

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اللُّقَطَةِ وَضَالَّةِ الإِبِلِ وَالغَنَمِ

١٣٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَزِيدَ مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَوِعَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ اسْتَنْفِقْ بِهَا، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَضَالَّةُ الغَنَمِ، فَقَالَ: خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَضَالَّةُ الإِبِلِ، قَالَ: فَغَضِبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ، أَوْ احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا حِذَاؤُهَا وَسِقَاؤُهَا حَتَّى تَلْقَى رَبَّهَا. ناقص. وَحَدِيثُ يَزِيدَ مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پیاوێ دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، لەپاشدا بزانـە تورەکەکـەو پـەتی دەم بەستنەکەی چیە و چۆنەو ژمارەی چەندە جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیـدەرەوە، ئەگەر خاوەنەکەشی نەهات بۆ خۆت سـودی لـێ وەربگـرە). وتم: ئـەی پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئـەی مـەڕ و بزنـی ون بـوو حـوکمی چیـیە؟ فـەرمووی: (بیبە بۆ خۆت چونکە یان بۆ تۆیە یان بۆ براکـەت، یـا بـۆ گـورگ واتـە یـا گـورگ دەیخوات - ئەگەر خاوەنی هات بیدەرەوە -). وتم: ئەی پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیه وسلم، ئەی وشتری ون بوو حوکمی چیـیە؟ پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم ئەوەندە تووڕە بوو هەتا کوڵمی یان ڕووخساری سووربوەوە، فەرمووی: (بە تـۆ چی و چیتە بەسەریەوە ئەتوانێ ڕێ بکات و بەشی خـۆی ئـاوی پێیـەو ئـەتوانێ بـۆ

خۆی لەو بیابانەدا بژی، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە).

١٣٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الحَنَفِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الضَّحَّاكُ بْنُ عُثْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ اعْتُرِفَتْ فَأَدِّهَا، وَإِلاَّ فَاعْرِفْ وِعَاءَهَا وَعِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا وَعَدَدَهَا، ثُمَّ كُلْهَا، فَإِذَا جَاءَ صَاحِبُهَا فَأَدِّهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَالجَارُودِ بْنِ الْمُعَلَّى، وَعِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ، وَجَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ.حَدِيثُ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. قَالَ أَحْمَدُ: أَصَحُّ شَيْءٍ فِي هَذَا البَابِ هَذَا الحَدِيثُ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، وَرَخَّصُوا فِي اللُّقَطَةِ إِذَا عَرَّفَهَا سَنَةً، فَلَمْ يَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: يُعَرِّفُهَا سَنَةً فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ تَصَدَّقَ بِهَا. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الكُوفَةِ: لَمْ يَرَوْا لِصَاحِبِ اللُّقَطَةِ أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا إِذَا كَانَ غَنِيًّا. وقَالَ الشَّافِعِيُّ: يَنْتَفِعُ بِهَا وَإِنْ كَانَ غَنِيًّا لأَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَصَابَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صُرَّةً فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعَرِّفَهَا ثُمَّ يَنْتَفِعَ بِهَا وَكَانَ أُبَيٌّ كَثِيرَ الْمَالِ مِنْ مَيَاسِيرِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعَرِّفَهَا فَلَمْ يَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْكُلَهَا، فَلَوْ كَانَتِ اللُّقَطَةُ لَمْ تَحِلَّ إِلاَّ لِمَنْ تَحِلُّ لَهُ الصَّدَقَةُ لَمْ تَحِلَّ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ لأَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ أَصَابَ دِينَارًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَرَّفَهُ فَلَمْ يَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهُ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَكْلِهِ، وَكَانَ لاَ يَحِلُّ لَهُ

الصَّدَقَةُ. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِذَا كَانَتِ اللُّقَطَةُ يَسِيرَةً أَنْ يَنْتَفِعَ بِهَا، وَلاَ يُعَرِّفَهَا. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ دُونَ دِينَارٍ يُعَرِّفُهَا قَدْرَ جُمْعَةٍ وَهُوَ قَوْلُ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە، ئەگەر نەهات بزانە تورەکەکەو پەتی دەم بەستنەکەی چیە و چۆنەو ژمارەی چەندە، لەپاشدا بیخۆ، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە).

١٣٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ زَيْدِ بْنِ صُوحَانَ، وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ، فَوَجَدْتُ سَوْطًا، قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ فِي حَدِيثِهِ، فَالتَقَطْتُ سَوْطًا، فَأَخَذْتُهُ، قَالاَ: دَعْهُ، فَقُلْتُ: لاَ أَدَعُهُ تَأْكُلُهُ السِّبَاعُ، لآخُذَنَّهُ فَلأَسْتَمْتِعَنَّ بِهِ، فَقَدِمْتُ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، وَحَدَّثْتُهُ الحَدِيثَ، فَقَالَ: أَحْسَنْتَ، وَجَدْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صُرَّةً فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ لِي: عَرِّفْهَا حَوْلاً، فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، فَمَا أَجِدُ مَنْ يَعْرِفُهَا ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ: عَرِّفْهَا حَوْلاً آخَرَ، فَعَرَّفْتُهَا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ: عَرِّفْهَا حَوْلاً آخَرَ، وَقَالَ: أَحْصِ عِدَّتَهَا، وَوِعَاءَهَا، وَوِكَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا فَأَخْبَرَكَ بِعِدَّتِهَا، وَوِعَائِهَا، وَوِكَائِهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ، وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ زەیدی کوڕی صوحان و سەلمانی کوڕی ڕەبیعەدا دەرچووم بۆ

غەزا، قامچیەکم دۆزیەوە، پێیان وتم: فڕێی بدە، وتم: نەخێر فڕێی نادەم ئەگەر خاوەنەکەیم دۆزیەوە دەیدەمەوە ئەگینا سودی لێ وەردەگرم، فڕێی نادەم درندە بیخوات، کاتێ کە چووم بۆ حەج، سەبارەت بە قامچیەکە لە ئوبەی کوڕی کەعبم پرسی؟ ئەویش وتی: چاکت کرد، جارێ تورەکەیەکم دۆزیەوە سەد دیناری تێدا بوو، جا چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا کەس خاوەنی نەبوو، لەپاشدا ڕۆیشتمەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا کەس خاوەنی نەبوو، لەپاشدا ڕۆشتمەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا، لەپاشدا ڕۆشتمەوە بۆ خزمەتی وتم: کەسم دەست نەکەوت خاوەنی بێت، فەرمووی: (بزانە تورەکەکەو پەتی دەم بەستنەکەی چۆنەو ژمارەی چەندە جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە، ئەگەر خاوەنەکەشی نەهات بۆ خۆت سودی لێ وەربگرە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی وەقف

٣٦ - بَابٌ فِي الوَقْفِ

١٣٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَصَبْتُ مَالاً بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُنِي، قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ أَنَّهَا لاَ يُبَاعُ أَصْلُهَا، وَلاَ يُوهَبُ، وَلاَ يُورَثُ، تَصَدَّقَ بِهَا فِي الفُقَرَاءِ، وَالقُرْبَى، وَالرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. قَالَ: فَذَكَرْتُهُ لِمُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ فَقَالَ: غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً. قَالَ ابْنُ عَوْنٍ:

فَحَدَّثَنِي بِهِ رَجُلٌ آخَرُ أَنَّهُ قَرَأَهَا فِي قِطْعَةِ أَدِيمٍ أَحْمَرَ، غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً. قَالَ إِسْمَاعِيلُ: وَأَنَا قَرَأْتُهَا عِنْدَ ابْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فَكَانَ فِيهِ غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَ الْمُتَقَدِّمِينَ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ اخْتِلاَفًا فِي إِجَازَةِ وَقْفِ الأَرَضِينَ وَغَيْرِ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: باوکم لە خەیبەر زەویەکی دەستکەوت، چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە خەیبەر زەویەکم دەستکەوتوە هەرگیز مالّی ئەوەندە نایاب و بەنرخم نەبووە، جا دەربارەی بەخشینی فەرمانم بەچی پیّ دەکەیت؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر دەتەوێت ئەسڵەکەی وەقف بکەو داهات و دەرامەتەکەی بکە بەخێر)، پێشەوا عومەر رەزای خوای لیّ بیّ زەویەکەی کرد بەخێر بەمەرجیّ کە نەفرۆشرێت و، نەبەخشرێت و، بە میرات نەبرێت و نەکرێتە مولّکی کەس، بەڵکو داهاتەکەی بۆ هەژاران و، خزمان و، ئازادکردنی کۆیلەو، لەرێگەی خواو، بۆ رێبوار و میوان سەرف بکرێت، ئەو کەسەش کە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکات گوناهی ناگات ئەگەر بەچاکی لێی بخوات، یان دەرخواردی برادەری خۆی بدات بەلاّم لێی پاشەکەوت نەکات و لێی لانەدات). راوی فەرمووی: ئەمەم گێرایەوە بۆ موحەممەدی کوڕی سیرین فەرمووی: وە نەیکات بە مولّکی خۆشی.

١٣٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثٍ: صَدَقَةٌ جَارِيَةٌ، وَعِلْمٌ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرمـوویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کاتێ ئادەمیزاد مـرد لـە کردەوەکـەی دادەبـڕێ، تـەنها لـەم سـێ شـتەدا نـەبێت: خێرێکـی بـەردەوام، یـان زانیاریەك بڵاویکاتەوە سودی لێ وەرگیرێت، یـا منـداڵێکی صـاڵح و چـاك دوعـای خێری بۆ بکات).

## ئەگەر ئاژەڵی بەرەڵا کەسێ بریندار بکات بە فیڕۆ دەڕوات

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي: العَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ

١٣٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: العَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالبِئْرُ جُبَارٌ، وَالمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ، حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَعَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، عَنْ مَعْنٍ قَالَ: قَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ. وَتَفْسِيرُ حَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ العَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، يَقُولُ: هَدَرٌ لاَ دِيَةَ فِيهِ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ: العَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، فَسَّرَ ذَلِكَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ قَالُوا: العَجْمَاءُ: الدَّابَّةُ الْمُنْفَلِتَةُ مِنْ صَاحِبِهَا، فَمَا أَصَابَتْ فِي انْفِلاَتِهَا فَلاَ غُرْمَ عَلَى صَاحِبِهَا، وَالمَعْدِنُ جُبَارٌ، يَقُولُ: إِذَا احْتَفَرَ الرَّجُلُ مَعْدِنًا فَوَقَعَ فِيهَا إِنْسَانٌ فَلاَ غُرْمَ عَلَيْهِ، وَكَذَلِكَ البِئْرُ إِذَا احْتَفَرَهَا الرَّجُلُ لِلسَّبِيلِ، فَوَقَعَ فِيهَا إِنْسَانٌ فَلاَ غُرْمَ عَلَى صَاحِبِهَا، وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ، وَالرِّكَازُ: مَا وُجِدَ فِي دَفْنِ أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ فَمَنْ وَجَدَ رِكَازًا أَدَّى مِنْهُ الخُمُسَ إِلَى السُّلْطَانِ وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَهُ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرمـوویـەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئاژەڵێ بەرەڵا بێ و كەسێ بریندار بكات یان كارێكی خراپ بكات ئەو كەسە یان ئەو شتە بە فیڕۆ دەڕوات و خوێنی نیەو خاوەنەكەی نابێتە زامن و دەستەبەر، ئەگەر كەسێ بیرێ هەڵكەنێ كەسێ بكەوێتە ناویەوەو بخنكێ یان زیانی پێ بگات ئەوە خاوەن بیرەكە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنەكەی بە فیڕۆ دەڕوات، كەسێ كرێكارێ بەكرێ بگرێت بۆ ئەوەی كان(معدن)ێكی بۆ هەڵكەنێ ئەگەر كانەكە روخا بەسەریا، یان روخا بەسەر كەسێكی تردا لەوێوە تێپەڕی ئەوە خاوەن كانەكە زامن و دەستەبەر نیەو خوێنی بەفیڕۆ دەڕوات، ریكاز پێنج یەك زەكاتی لێ دەكەوێت. - ئەبو داود دەڵێت: ئاژەڵی بەرەڵاش ئەوەی كە كەسی بەلاوە نیەو لەرۆژدا، نەك لەشەودا، چونكە ئەگەر بەشەوا بەرەڵا بكرێت و زیان بگەیەنێ خاوەنەكەی بەرپرسە لێی - .

## زیندووكردنەوەی زەویە پێشتر ئاوەدان نەكرابێتەوە

### ٣٨ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي إِحْيَاءِ أَرْضِ الْمَوَاتِ

١٣٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيِّتَةً فَهِيَ لَهُ وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، قَالُوا: لَهُ أَنْ يُحْيِيَ الأَرْضَ الْمَوَاتَ بِغَيْرِ إِذْنِ السُّلْطَانِ. وَقَدْ قَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ لَهُ أَنْ يُحْيِيَهَا إِلاَّ بِإِذْنِ السُّلْطَانِ. وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَعَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ جَدِّ كَثِيرٍ، وَسَمُرَةَ.

حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا الوَلِيدِ الطَّيَالِسِيَّ عَنْ قَوْلِهِ: وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ، فَقَالَ: العِرْقُ: الظَّالِمُ الغَاصِبُ الَّذِي يَأْخُذُ مَا لَيْسَ لَهُ. قُلْتُ: هُوَ الرَّجُلُ الَّذِي يَغْرِسُ فِي أَرْضِ غَيْرِهِ؟، قَالَ: هُوَ ذَاكَ.

واتـە: لـە سـەعیدی کـوڕی زەیـدەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: (هەرکەسێك زەویـەکی مـردو یان وێرانە ئاوەدان بکاتەوە ئەوە بـۆ خۆیـەتی و مـوڵکی ئـەوە، ئەگـەر کەسـێ لـە موڵکی کەسێکی تردا درەختێ بچێنێ بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی ئـەوە فـەرمانی پێ دەکرێت هەڵیکێشێ و هیچ مافێکی نیە بەو زەویەوە، مەگەر خاوەن موڵکەکـە خۆی رازی بێت وازی لێ بهێنرێت).

٣٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە جـابیری کـوڕی (عبـد الله)وە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: (هەرکەسێك زەویـەکی مـردو یان وێرانە ئاوەدان بکاتەوە ئەوە بۆ خۆیەتی و موڵکی ئەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی زەوی بۆ دابڕین

## ٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَطَائِعِ

١٣٨٠ - (حسن) قُلْتُ لِقُتَيْبَةَ بْنِ سَعِيدٍ، حَدَّثَكُمْ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ قَيْسٍ الْمَأْرِبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ شَرَاحِيلَ، عَنْ سُمَيِّ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ شُمَيْرٍ، عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ، أَنَّهُ وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَقْطَعَهُ الْمِلْحَ، فَقَطَعَ لَهُ، فَلَمَّا أَنْ وَلَّى قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمَجْلِسِ: أَتَدْرِي مَا قَطَعْتَ لَهُ؟ إِنَّمَا قَطَعْتَ لَهُ الْمَاءَ العِدَّ، قَالَ:

فَانْتَزَعَهُ مِنْهُ، قَالَ: وَسَأَلَهُ عَمَّا يُحْمَى مِنَ الأَرَاكِ، قَالَ: مَا لَمْ تَنَلْهُ خِفَافُ الإِبِلِ. فَأَقَرَّ بِهِ قُتَيْبَةُ وَقَالَ: نَعَمْ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ قَيْسٍ الْمَأْرِبِيُّ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. المَأْرِبُ نَاحِيَةٌ مِنَ اليَمَنِ. وَفِي البَابِ عَنْ وَائِلٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ. حَدِيثُ أَبْيَضَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي القَطَائِعِ يَرَوْنَ جَائِزًا أَنْ يُقْطِعَ الإِمَامُ لِمَنْ رَأَى ذَلِكَ.

واتە: لە (أبیض)ی کوڕی حەمالەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّرنەوە، کە نویّنەر بووە چوەتە خزمەت پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای کانی میلحی لیّ کرد کە کانیّ بوو لە کانەکان، پیّغەمبەریش صلی الله علیه وسلم پیّی بەخشی، کاتیّ کە رۆشت یەکیّ لە دانیشتوان وتی: ئایا دەزانی چیت پیّ بەخشیوە، کانیّکی ئامادەکراوت پیّ بەخشیوە کە شویّنەکەی نزیکە بەردەوام خیّر و بیّری هەیە بۆ خەڵکەکە بەگشتی، پیّویست ناکات کاری تیّدا بکەن و خۆیانی تیّدا ماندو بکەن بە ئاسانی سودی لیّ دەبینن وەك چۆن سود لەئاو دەبینن، راوی وتی: پیّغەمبەر صلی الله علیه وسلم کانەکەی لە (أبیض) سەندەوە، راوی وتی: داوای زەویەکی کرد کە ئەراك داری (سیواك)ی تیّدا بیّ بۆی پاوەن بکریّت، فەرمووی: (باشە بە مەرجیّ ئەوەندە دور بیّت وشتری نەگاتیّ لیّی بلەوەڕیّت).

١٣٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَهُ أَرْضًا بِحَضْرَمَوْتَ. قَالَ مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا النَّضْرُ، عَنْ شُعْبَةَ، وَزَادَ فِيهِ، وَبَعَثَ مَعَهُ مُعَاوِيَةَ لِيُقْطِعَهَا إِيَّاهُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سیماکەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گویّم لە عەلقەمەی کوڕی وائیل بوو لە باوکیەوە دەیگیّڕایەوە، کە پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەویەکی بۆ تەرخان کرد لە (حَضْرَمَوْت).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی درەخت رواندن**

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الغَرْسِ

١٣٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ إِنْسَانٌ، أَوْ طَيْرٌ، أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلاَّ كَانَتْ لَهُ صَدَقَةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، وَجَابِرٍ، وَأُمِّ مُبَشِّرٍ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ درەختێکی بەردار بروێنێ یان کشتوکاڵێ بکات ئادەمیزاد یان باڵندە یا ئاژەڵ لێی بخوات ئەوە بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی موزارەعە**

٤١ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الْمُزَارَعَةِ

١٣٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: لَمْ يَرَوْا بِالمزَارَعَةِ بَأْسًا عَلَى النِّصْفِ وَالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ، وَاخْتَارَ بَعْضُهُمْ: أَنْ يَكُونَ البَذْرُ مِنْ رَبِّ الأَرْضِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الْمُزَارَعَةَ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ، وَلَمْ يَرَوْا بِمُسَاقَاةِ النَّخِيلِ بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ بَأْسًا، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَلَمْ يَرَ بَعْضُهُمْ أَنْ يَصِحَّ شَيْءٌ مِنَ الْمُزَارَعَةِ إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْجِرَ الأَرْضَ بِالذَّهَبِ وَالفِضَّةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا رێکەوت لەسەر نیوەی درامەتی بەروبووم و دانەوێڵە.

**باسێك دەربارەی موزارەعە**

٤٢ - بَابٌ مِنَ الْمُزَارَعَةِ

١٣٨٤ - **(صحيح لكن ذكر الدراهم شاذ)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي حُصَيْنٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعًا، إِذَا كَانَتْ لأَحَدِنَا أَرْضٌ أَنْ يُعْطِيَهَا بِبَعْضِ خَرَاجِهَا أَوْ بِدَرَاهِمَ، وَقَالَ: إِذَا كَانَتْ لأَحَدِكُمْ أَرْضٌ فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ أَوْ لِيَزْرَعْهَا.

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کرد لە کارێك کە بەسودە بۆمان - بەڵام گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای گەورەو پێغەمبەری خوا بەسود ترە بۆمان - ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی و زار بۆ چاندن بە هەندێ لە بەروبوومەکەی یان بە چەند دەرهەمێك، فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە پارچە زەویەکی هەبوو با بیدات بە براکەی یان کشتوکاڵی تێدا بکات).

١٣٨٥ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى السِّينَانِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُحَرِّمِ الْمُزَارَعَةَ، وَلَكِنْ أَمَرَ أَنْ يَرْفُقَ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَدِيثُ رَافِعٍ فِيهِ اضْطِرَابٌ يُرْوَى هَذَا

الحَدِيثُ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ عُمُومَتِهِ، وَيُرْوَى عَنْهُ عَنْ ظُهَيْرِ بْنِ رَافِعٍ وَهُوَ أَحَدُ عُمُومَتِهِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْهُ عَلَى رِوَايَاتٍ مُخْتَلِفَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَجَابِرٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موزارەعەی حەرام نەکردووە، بەڵکو فەرمانی کرد هەندێکتان بە بەزەیی بن بەرامبەر بە هەندێکی ترتان.

# باسەکانی خوێنبایی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

# ١٤ - أَبْوَابُ الدِّيَاتِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی چەند سەر وشترە؟

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدِّيَةِ كَمْ هِيَ مِنَ الإِبِلِ

١٣٨٦ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ خِشْفِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دِيَةِ الخَطَإِ عِشْرِينَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَعِشْرِينَ بَنِي مَخَاضٍ ذُكُورًا، وَعِشْرِينَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَعِشْرِينَ جَذَعَةً، وَعِشْرِينَ حِقَّةً. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. أَخْبَرَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ، وَأَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ نَحْوَهُ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ مَوْقُوفًا. وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إِلَى هَذَا، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ أَجْمَعَ أَهْلُ العِلْمِ عَلَى أَنَّ الدِّيَةَ تُؤْخَذُ فِي ثَلاَثِ سِنِينَ، فِي كُلِّ سَنَةٍ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَرَأَوْا أَنَّ دِيَةَ الخَطَإِ عَلَى العَاقِلَةِ، وَرَأَى بَعْضُهُمْ أَنَّ العَاقِلَةَ قَرَابَةُ الرَّجُلِ مِنْ قِبَلِ أَبِيهِ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا الدِّيَةُ عَلَى الرِّجَالِ دُونَ النِّسَاءِ، وَالصِّبْيَانِ مِنَ العَصَبَةِ، يُحَمَّلُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ رُبُعَ دِينَارٍ، وَقَدْ قَالَ بَعْضُهُمْ: إِلَى نِصْفِ دِينَارٍ فَإِنْ تَمَّتِ الدِّيَةُ، وَإِلاَّ نُظِرَ إِلَى أَقْرَبِ القَبَائِلِ مِنْهُمْ فَأُلْزِمُوا ذَلِكَ.

واتە: لە خەشفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئیبنو مەسعود بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاریدا خوێنی کوشتنی هەڵە دەکاتە: بیست سەر وشتری مێی یەك ساڵە، بیست سەر وشتری نێری یەك ساڵە، بیست سەر وشتری مێی دوو ساڵە، بیست سەر وشتری مێی چوار ساڵە، بیست سەر وشتری مێی سێ ساڵە).

هەندێ لە زانایان لەسەر ئەم رایەن، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاقە. زانایان کۆ و یەکدەنگن لەسەر ئەوەی خوێنایی بە سێ ساڵ وەردەگیرێت، هەر ساڵەو سێ یەکی وەردەگیرێت، خوێنایی لەسەر خزمانی باوکە، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و مالیکە. هەندێکیان دەفەرموون: خوێنایی لەسەر پیاوانە نەك ژن و منداڵ لە خزمانی باوك، هەر پیاوە و چارەکە دینارێکی دەکەوێت، بێگومان هەندێکیان دەفەرموون: هەر پیاوە و نیو دیناری دەکەوێت، ئەگەر خوێناییەکە تەواو بوو ئەوە باشە، ئەگەر تەواو نەبوو سەرنج دەدرێت دەخرێتە ئەستۆی نزیکترین هۆز لێیانەوە.

١٣٨٧ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الدَّارِمِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَبَّانُ وَهُوَ ابْنُ هِلاَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَاشِدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ مُوسَى، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ، فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوا، وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ، وَهِيَ ثَلاَثُونَ حِقَّةً، وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً، وَمَا صَالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ، وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ العَقْلِ: حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بە ئارەزوو باوەڕدارێ بکوژێ ئەوە دەدرێتە دەست

کەسوکار و خاوەنی کوژراوەکە ئیتر ئارەزووی خۆیانە: ئەگەر ویستیان دەیکوژنەوە، ئەگەر ویستیان خوێنبایی وەردەگرن، خوێنبایش سەد وشترە بەم شێوەیە: سی سەر وشتری مێی سێ ساڵە، سی سەر وشتری مێی چوار ساڵە، چل سەر وشتری ئاوسە، هەردوولا لەسەر هەرچی رێك بكەون دروستە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە هەتا خوێنبایی گران بێ و کەس بیر لە خوێنڕشتن نەکاتەوە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی چەند درهەمە؟

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدِّيَةِ كَمْ هِيَ مِنَ الدَّرَاهِمِ؟

١٣٨٨ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هَانِئٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمٍ الطَّائِفِيُّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ جَعَلَ الدِّيَةَ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاریدا خوێنبایی دوانزە هەزار درهەمە.

١٣٨٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَفِي حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا. وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا يَذْكُرُ فِي هَذَا الحَدِيثِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ غَيْرَ، مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ الدِّيَةَ عَشَرَةَ آلاَفٍ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الْكُوفَةِ وقَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ أَعْرِفُ الدِّيَةَ إِلاَّ مِنَ الإِبِلِ، وَهِيَ: مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ.

هەندێ لە زانایان رایان وایە خوێنبایی دوانزە هەزار درهەمە، ئەمەش وتەی

پێشەوا سوفیانی (ثوري) و خەڵکی کوفەیە. پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: خوێنبایی سەد وشترە، پێ نازانم جگە لە سەد وشتر یان قیمەتی سەد وشتر شتێکی تر بێت.

## دەربارەی خوێنبایی ئەو زامانەی کە ئێسکیان دەردەکەوێ

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُوضِحَةِ

١٣٩٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ خَمْسٌ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ: أَنَّ فِي الْمُوضِحَةِ خَمْسًا مِنَ الإِبِلِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو زامانەی کە ئێسکیان دەردەکەوێت خوێنبایی هەر زامێ دەکاتە پێنج وشتر).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی پەنجەکان

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دِيَةِ الأَصَابِعِ

١٣٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ النَّحْوِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دِيَةِ الأَصَابِعِ اليَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ سَوَاءٌ، عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ

لِكُلِّ أُصْبُعٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي مُوسَى، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی پەنجەكانی دەست و قاچ وەك یەكە، بۆ هەر پەنجەیە دە وشتر).

١٣٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ، يَعْنِي: الخِنْصَرَ وَالإِبْهَامَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوێنبایی ئەمەو ئەوە وەك یەكن، واتە: پەنجە توتەو پەنجە كەڵە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لێبوردن

### ٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَفْوِ

١٣٩٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو السَّفَرِ، قَالَ: دَقَّ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ سِنَّ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَاسْتَعْدَى عَلَيْهِ مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ لِمُعَاوِيَةَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ هَذَا دَقَّ سِنِّي، قَالَ مُعَاوِيَةُ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ، وَأَلَحَّ الآخَرُ عَلَى مُعَاوِيَةَ فَأَبْرَمَهُ، فَلَمْ يُرْضِهِ، فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ: شَأْنَكَ بِصَاحِبِكَ، وَأَبُو الدَّرْدَاءِ جَالِسٌ عِنْدَهُ، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ:

سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ يُصَابُ بِشَيْءٍ فِي جَسَدِهِ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهِ خَطِيئَةً، قَالَ الأَنْصَارِيُّ: أَأَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي، قَالَ: فَإِنِّي أَذَرُهَا لَهُ، قَالَ مُعَاوِيَةُ: لاَ جَرَمَ لاَ أُخَيِّبُكَ، فَأَمَرَ لَهُ بِمَالٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَلاَ أَعْرِفُ لأَبِي السَّفَرِ سَمَاعًا مِنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَأَبُو السَّفَرِ اسْمُهُ سَعِيدُ بْنُ أَحْمَدَ، وَيُقَالُ: ابْنُ يُحْمِدَ الثَّوْرِيُّ.

واتە: لە ئەبو سەفەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێکی قورەیشی ددانی پیاوێکی ئەنصاری شکاند، هانای بردە لای موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ، وتی: ئەی پێشەوای بڕواداران ئەم پیاوە ددانێکی شکاندوم، موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من ڕازیت دەکەم، کابرا ئیلحاحی دەکردوو ڕازی نەدەبوو، موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ پێی فەرموو: دەی ئەوە تۆ و هاوڕێکەت، لەو کاتەدا ئەبو دەرداء ڕەزای خوای لێ بێ لای موعاویە دانیشتبوو، فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: دەیفەرموو: (هەرکەسێ لەلایەن کەسێکەوە جەستەی بریندار بکرێ یان پارچەیەکی لێ ببڕن لێ بوردنی هەبێ و لە بەرامبەرەکەی خۆش ببێ ئەوە خوای گەورە پلەیە بەرزی دەکاتەوە و لە تاوانێکیشی خۆش دەبێ). پیاوە ئەنصاریەکە وتی: ئایا تۆ ئەمەت بیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: بەڵێ بەم دوو گوێچکەیە گوێم لێی بوو، بەدڵیش وەرم گرت، پیاوە ئەنصاریەکە وتی: دەی ئەوا من وازی لێ دەهێنم، موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: نائومێدت ناکەم، فەرمانی دا ماڵ و سامانی بدرێتێ.

## دەربارەی ئەو کەسەی بە بەرد سەری بشکێنرێ

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ رُضِخَ رَأْسُهُ بِصَخْرَةٍ

١٣٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَرَجَتْ جَارِيَةٌ عَلَيْهَا أَوْضَاحٌ، فَأَخَذَهَا يَهُودِيٌّ فَرَضَخَ رَأْسَهَا بِحَجَرٍ، وَأَخَذَ مَا عَلَيْهَا مِنَ الحُلِيِّ، قَالَ: فَأُدْرِكَتْ وَبِهَا رَمَقٌ، فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: مَنْ قَتَلَكِ، أَفُلاَنٌ؟، قَالَتْ بِرَأْسِهَا: لاَ، قَالَ: فَفُلاَنٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ اليَهُودِيُّ، فَقَالَتْ بِرَأْسِهَا: نَعَمْ، قَالَ: فَأُخِذَ، فَاعْتَرَفَ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لاَ قَوَدَ إِلاَّ بِالسَّيْفِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کچۆڵەیەك هەندێ خشڵی پێوە بوو، پیاوێکی جولەکە بە بەرد سەری شکاندبوو، خشڵەکەی بردبوو، بە نیوە گیانی هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم پێی فەرموو: (کێ وای لێ کردی فلان کەس سەری شکاندی؟) بەسەری ئاماژەی دەکرد دەیوت: نەخێر، فەرمووی: (کێ وای لێ کردی فلان کەس بوو؟) بەسەری ئاماژەی دەکرد دەیوت: نەخێر، هەتا گەیشتە سەر فلان جولەکە بەسەری ئاماژەی کرد وتی: بەڵێ، هێنایان، دانی نا بە تاوانەکەیدا، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمانی دا لەنێوان دوو بەرددا سەری ئەویشیان شکاند.

## دەربارەی هەڕەشەی توند لەو كەسانەی باوەڕدار دەكوژن

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَشْدِيدِ قَتْلِ الْمُؤْمِنِ

١٣٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي عَدِيٍّ وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَبُرَيْدَةَ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو هَكَذَا رَوَاهُ ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَوَى مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ فَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَهَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ مَوْقُوفًا وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الْمَرْفُوعِ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەمانی دونیا سوكتر و ئاسانترە بەلای خواوە لە كوشتنی پیاوێكی موسوڵمان).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی حوكمی خوێنڕشتن

٨ - بَابُ الحُكْمِ فِي الدِّمَاءِ

١٣٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحْكَمُ بَيْنَ العِبَادِ فِي الدِّمَاءِ. حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ حَدِيثٌ حَسَنٌ

صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الأَعْمَشِ مَرْفُوعًا، وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنِ الأَعْمَشِ وَلَمْ يَرْفَعُوهُ.

واتـە: لـە (عبـد الله)وە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموويـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم فەرموويـەتی: (يەكـەم مەحكەمـە لـەنێوان بەندەكانـدا لەسـەر خۆێنڕشـتنە واتـە مرۆڤـەكان يەكـەم جـار لەسـەر خوێنڕشـتن مەحكەمە دەكرێن).

١٣٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُقْضَى بَيْنَ العِبَادِ فِي الدِّمَاءِ.

واتـە: لـە (عبـد الله)وە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموويـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (يەكەم شتێ كە مرۆڤ لەسـەری مەحكەمە دەكرێت خوێنڕشتنە).

١٣٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ يَزِيدَ الرَّقَاشِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الحَكَمِ البَجَلِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرَانِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأَكَبَّهُمُ اللهُ فِي النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو الحَكَمِ البَجَلِيُّ هُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي نُعْمٍ الكُوفِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەيرە و ئەبو سەعيدی خودری رەزای خوايان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (ئەگەر خـەڵكی ئاسمانـەكان و زەوی بە هاوبەشی خوێنی براداری بە نارەوا برێژن، خوای گەورە هـەر هـەموويان بەسەردا دەخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

## دەربارە ئەگەر پیاوێ كوڕەكەی بكوژێ دەكوژرێتەوە یان نا؟

### ٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَقْتُلُ ابْنَهُ يُقَادُ مِنْهُ أَمْ لاَ

١٣٩٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشَمٍ قَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقِيدُ الأَبَ مِنْ ابْنِهِ، وَلاَ يُقِيدُ الإِبْنَ مِنْ أَبِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ سُرَاقَةَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِصَحِيحٍ، رَوَاهُ إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ الْمُثَنَّى بْنِ الصَّبَّاحِ، وَالمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ مُرْسَلاً. وَهَذَا حَدِيثٌ فِيهِ اضْطِرَابٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ الأَبَ إِذَا قَتَلَ ابْنَهُ لاَ يُقْتَلُ بِهِ، وَإِذَا قَذَفَ ابْنَهُ لاَ يُحَدُّ.

واتە: لە سوراقەی كوڕی مالیكی كوڕی جوعشەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: خۆم ئامادە بووم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كوڕی كوشتەوە لەسەر ئەوەی باوكی خۆی كوشتبوو، بەڵام ئەگەر باوكێ كوڕی خۆی بكوشتایە نەیدەكوشتەوە.

١٤٠٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يُقَادُ الوَالِدُ بِالوَلَدِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (باوك لەسەر كوشتنی كوڕی خۆی تۆڵەی لێ ناكرێتەوە و ناكوژرێتەوە).

١٤٠١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُقَامُ الحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَلاَ يُقْتَلُ الوَالِدُ بِالوَلَدِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ مَرْفُوعًا، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ الْمَكِّيُّ قَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە لەناو لەمزگەوتەکاندا حەددی شەرعی جێبەجێ دەکرێت، نە باوکیش لەسەر کوشتنی کوڕی خۆی دەکوژرێتەوە).

## کوشتنی مرۆڤی موسوڵمان حەڵاڵ نیە، لە سێ حاڵەتدا نەبێت

### ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ

١٤٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُثْمَانَ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەڵاڵ نیە خوێن رشتنی مرۆڤی موسوڵمان کە شایەتومانی بهێنێ و بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ). واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله)، وە منیش نێرراوی خوای گەورەم. مەگەر لەم سێ حاڵەتەدا: زەواجی

کردبێت و زینای کردبێت، گیان لەتۆڵەی گیان واتە موسڵمانێکی بە ناڕەوا کوشتبێت، یان پاشگەزبووبێتەوە لە ئیسلام و لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیابوبێتەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی خاوەن پەیمانێ بکوژێ

١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقْتُلُ نَفْسًا مُعَاهِدَةً

١٤٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْدِيُّ بْنُ سُلَيْمَانَ هُوَ البَصْرِيُّ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلاَ مَنْ قَتَلَ نَفْسًا مُعَاهِدًا لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَقَدْ أَخْفَرَ بِذِمَّةِ اللهِ، فَلاَ يُرَحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ سَبْعِينَ خَرِيفًا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگادارین هەر کەسێ کەسێکی خاوەن پەیمان بکوژێت کە لە پەنای خواو پێغەمبەرەکەیدا بێت، ئەوە ئەو کەسە غەدری لەو پەیمانە کردووە و هەڵیوەشاندۆتەوە، بۆنی بەهەشت ناکات، لەکاتێکدا کە بۆنی بەهەشت ماوەی حەفتا ساڵ ڕێ بۆنی دەڕوات).

## باسێکی تر لەوبارەوە

١٢ - بَابٌ

١٤٠٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي سَعْدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَدَى العَامِرِيَّيْنِ بِدِيَةِ الْمُسْلِمِينَ، وَكَانَ لَهُمَا عَهْدٌ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو سَعْدٍ البَقَّالُ اسْمُهُ سَعِيدُ بْنُ الْمَرْزُبَانِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوێنبایی دوو پیاوە عامیریەکەی وەك خوێنبایی دوو موسوڵمان دانا، چونکە خاوەن پەیمانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوون. - عەمری کوڕی ئومەییە نەیزانی کە خاوەن پەیمانن کوشتنی -.

## خاوەن کوژراو دوو ڕێگەی لەپێشە: کوشتنەوەی بکوژ و لێبوردن

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حُكْمِ وَلِيِّ القَتِيلِ فِي القِصَاصِ وَالعَفْوِ

١٤٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، وَيَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مَكَّةَ قَامَ فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يَعْفُوَ، وَإِمَّا أَنْ يَقْتُلَ. وَفِي البَابِ عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي شُرَيْحٍ خُوَيْلِدِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە خوای گەورە لەسەردەستی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم شاری مەککەی ڕزگار کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەستا وتاری خوێندەوە بۆ

موسـولّمانان، سـوپاس و ستایشـی خـوای كـرد، لەپاشـدا فـەرمووی: (هەركەسـێ كەسێكی لێ كوژرا ئەوە بۆ ئـەو دوو رێگـا هەیـە: یـان دەبـێ لێـی خـۆش بـێ، یـا لەجیاتی كوژراوی خۆیدا دەیكوژێ).

١٤٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الكَعْبِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ، مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَسْفِكَنَّ فِيهَا دَمًا، وَلاَ يَعْضِدَنَّ فِيهَا شَجَرًا، فَإِنْ تَرَخَّصَ مُتَرَخِّصٌ، فَقَالَ: أُحِلَّتْ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنَّ اللهَ أَحَلَّهَا لِي وَلَمْ يُحِلَّهَا لِلنَّاسِ، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، ثُمَّ هِيَ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، ثُمَّ إِنَّكُمْ مَعْشَرَ خُزَاعَةَ قَتَلْتُمْ هَذَا الرَّجُلَ مِنْ هُذَيْلٍ وَإِنِّي عَاقِلُهُ، فَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ بَعْدَ اليَوْمِ، فَأَهْلُهُ بَيْنَ خِيرَتَيْنِ، إِمَّا أَنْ يَقْتُلُوا، أَوْ يَأْخُذُوا العَقْلَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَاهُ شَيْبَانُ أَيْضًا، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ مِثْلَ هَذَا وَرُوِيَ عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الخُزَاعِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَلَهُ أَنْ يَقْتُلَ، أَوْ يَعْفُوَ، أَوْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ وَذَهَبَ إِلَى هَذَا بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتـە: لـە ئـەبو شـورەیحی كەعبیـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (خـوای گـەورە خۆی شاری مەككەی بەرزراگرتوە و رێزی تایبەتی بۆ داناوە و زەویەكەی كردووە بە حەرەم، نەك خەڵك، ئەو كەسەی باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایـی هەیـە بـا خـوێنی تێـدا نەرێـژێ، دار و درەختـی نـەبڕێ، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرمووی: (رێگە بە من درا سەعاتێ لەڕۆژدا جەنگی تێدا بكەم، ئیتر بۆ كەسی تر حەڵاڵ نیە جەنگی تێدا بكات هەتا رۆژی قیامەت، لەپاشدا ئەی كۆمـەڵی خوزاعـە

ئێوە ئەم پیاوەتان كوشتوە لە هۆزی (هُذیل)، من خوێنەكەی دەدەم، بەلاّم لەدوای ئەم فەرمایشتەم لەوبارەوە هەركەسێ كەسێكی لێ كوژرا ئەوە بۆ كەسوكارەكەی دوو رێگا هەیە: یان دەبێ لەباتی كوژراوەكەیاندا بیكوژنەوە، یا دەبێ خوێنبایی وەربگرن).

١٤٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قُتِلَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَدُفِعَ القَاتِلُ إِلَى وَلِيِّهِ، فَقَالَ القَاتِلُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَاللهِ مَا أَرَدْتُ قَتْلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ قَوْلُهُ صَادِقًا فَقَتَلْتَهُ دَخَلْتَ النَّارَ، فَخَلَّى عَنْهُ الرَّجُلُ، وَكَانَ مَكْتُوفًا بِنِسْعَةٍ، فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ، فَكَانَ يُسَمَّى ذَا النِّسْعَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالنِّسْعَةُ: حَبْلٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پیاوێ كوژرا، كێشەكەیان گەیاندە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەویش بكوژەكەی دایە دەستی خاوەن كوژراوەكە كە بیكوژێتەوە، بكوژەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوێند بە (الله) نەمویست بیكوژم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خاوەن كوژراوەكەی فەرموو: (ئەگەر ئەم پیاوە راست بكات و تۆ بیكوژیتەوە ئەوە ئەچیتە ئاگری دۆزەخەوە). ئیتر ئەویش بەرەلاّی كرد. پیاوكوژەكە بە قایشێ دەستی بەسترابوو كاتێ كە هاتەدەرەوە قایشەكەی بەدوای خۆیدا رادەكێشا ئیتر پێیان دەوت: كابرای خاوەن قایش.

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّفْيُ رَوَاهُ: أَبُو هُرَيْرَةَ، وَزَيْدُ بْنُ خَالِدٍ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، وَغَيْرُهُمْ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعَلِيٌّ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ، وَأَبُو ذَرٍّ، وَغَيْرُهُمْ وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کەسێ هاوسەرگیری نەکردایە و زینای بکردایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەلاقی لێ دەدا و ساڵێ دوردەخستەوە، هەروەها پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەریش رەزای خوایان لێ بێ.

## جێبەجێکردنی حەددی شەرعی کەفارەتە بۆ خاوەنەکەی

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الحُدُودَ كَفَّارَةٌ لأَهْلِهَا

١٤٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيِّ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَجْلِسٍ، فَقَالَ: تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، قَرَأَ عَلَيْهِمُ الآيَةَ، فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ عَلَيْهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَجَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَخُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ. حَدِيثُ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وقَالَ الشَّافِعِيُّ: لَمْ أَسْمَعْ فِي هَذَا البَابِ أَنَّ الحَدَّ يَكُونُ كَفَّارَةً لأَهْلِهِ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْ هَذَا الحَدِيثِ قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَأُحِبُّ

لِمَنْ أَصَابَ ذَنْبًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ أَنْ يَسْتُرَ عَلَى نَفْسِهِ وَيَتُوبَ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَبِّهِ وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ أَنَّهُمَا أَمَرَا رَجُلاً أَنْ يَسْتُرَ عَلَى نَفْسِهِ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەکۆڕو دانیشتنێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، فەرمووی: (بەڵێن و پەیمانم پێ بدەن کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، ئایەتێکی بۆ خوێندنەوە، ئەوەی وەفای هەبێ ئەوە خێر و پاداشتی لەسەر خوایە، هەرکەسێ تووشی تاوانێ بوو سزای بۆ دانرابوو ئەگەر سزادرا ئەوە دەبێتە کەفارەت بۆی، هەرکەسێ تووشی شتێ لەوشێوە بوو خوای گەورە بۆی پۆشی، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر ویستی سزای دەدات، ئەگەر ویستیشی لێی خۆش دەبێ).

## جێبەجێ کردنی حەددی شەرعی بەسەر کەنیزەکدا

### ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِقَامَةِ الحَدِّ عَلَى الإِمَاءِ

١٤٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا زَنَتْ أَمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيَجْلِدْهَا ثَلاَثًا بِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ عَادَتْ فَلْيَبِعْهَا، وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَشِبْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَالِكٍ الأَوْسِيِّ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، رَأَوْا أَنْ يُقِيمَ الرَّجُلُ الحَدَّ عَلَى مَمْلُوكِهِ دُونَ السُّلْطَانِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُرْفَعُ إِلَى السُّلْطَانِ، وَلاَ يُقِيمُ الحَدَّ هُوَ بِنَفْسِهِ، وَالقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەنیزەکی یەکێکتان زینای کرد بە پێی قورئان حەدی شەرعی خۆی بەسەردا جێبەجێ بکات و شەلاقی لێ بدات، سێ جار ئەمەی فەرموو، ئەگەر بۆ چوارەم جار دووبارەی کردەوە با بیفرۆشێ ئەگەر بە پەتێکی مووش بێ).

١٤٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ بْنُ قُدَامَةَ، عَنِ السُّدِّيِّ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قَالَ: خَطَبَ عَلِيٌّ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَقِيمُوا الحُدُودَ عَلَى أَرِقَّائِكُمْ مَنْ أَحْصَنَ مِنْهُمْ وَمَنْ لَمْ يُحْصِنْ، وَإِنَّ أَمَةً لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَنَتْ فَأَمَرَنِي أَنْ أَجْلِدَهَا، فَأَتَيْتُهَا فَإِذَا هِيَ حَدِيثَةُ عَهْدٍ بِنِفَاسٍ، فَخَشِيتُ إِنْ أَنَا جَلَدْتُهَا أَنْ أَقْتُلَهَا، أَوْ قَالَ: تَمُوتَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَحْسَنْتَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَالسُّدِّيُّ اسْمُهُ إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَهُوَ مِنَ التَّابِعِينَ قَدْ سَمِعَ مِنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَرَأَى حُسَيْنَ بْنَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ.

واتە: لە ئەبو (عبد الرحمن)ی سولەمییەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتاری دەدا فەرمووی: ئەی خەڵکینە حەددی شەرعی بەسەر بەندە و کەنیزەکەکانتاندا جێبەجێ بکەن، ئیتر هاوسەرگیریان کردبێ یان نا، کەنیزەکێکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زینای کرد، فەرمانی پێ کردم شەلاقی لێ بدەم، منیش بردم دەبینم خوێنی لەبەر دەڕوات، ترسام ئەگەر شەلاقی لێ بدەم بیکوژم یان بمرێت، بۆیە هێنام بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەسەرهاتەکەم بۆ باس کرد، فەرمووی: (کارێکی چاکت کرد).

## دەربارەی حەددی شەرعی سەرخۆش

### ١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ السَّكْرَانِ

١٤٤٢ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ مِسْعَرٍ، عَنْ زَيْدٍ العَمِّيِّ، عَنْ أَبِي الصِّدِّيقِ النَّاجِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَرَبَ الحَدَّ بِنَعْلَيْنِ أَرْبَعِينَ، قَالَ مِسْعَرٌ: أَظُنُّهُ فِي الخَمْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَزْهَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَالسَّائِبِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ. حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ وَأَبُو الصِّدِّيقِ النَّاجِيُّ اسْمُهُ بَكْرُ بْنُ عَمْرٍو، وَيُقَالُ: بَكْرُ بْنُ قَيْسٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چل نەعلی دەدا لە کەسی سەرخۆش.

١٤٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، يُحَدِّثُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الخَمْرَ فَضَرَبَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ الأَرْبَعِينَ، وَفَعَلَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ اسْتَشَارَ النَّاسَ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: كَأَخَفِّ الحُدُودِ ثَمَانِينَ، فَأَمَرَ بِهِ عُمَرُ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ حَدَّ السَّكْرَانِ ثَمَانُونَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ شەرابی خواردبۆوە هێنایان بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بە پەلکە خورما نزیکەی چل شەلاقی لێ دا، پێشەوا ئەبو بەکریش رەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا چل داری دەدا لە ئارەق خۆر، کاتێ کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفە هاوەڵانی پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم کۆکردەوەو راوێژی پێ کردن پێی فەرموون: ئارەق خواردن پەرەی سەندووە،

ئێوە لەبارەی حەدی ئارەق خۆرەوە راتان چۆنە؟ (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف پێی فەرموو: بەقەد کەمترین سزای لێ بکە کە هەشتا شەلاقە، جا پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرمانی دەرکرد و هەشتا داری بۆ ئارەق خۆر بڕیەوە.

## ئەوەی شەرابی خواردەوە تا سێ جار شەلاقی لێ بدەن، بۆ چوارەم جار بیکوژن

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ، وَمَنْ عَادَ فِي الرَّابِعَةِ فَاقْتُلُوهُ

١٤٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ فِي الرَّابِعَةِ فَاقْتُلُوهُ. قَالَ: وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَالشَّرِيدِ، وَشُرَحْبِيلَ بْنِ أَوْسٍ، وَجَرِيرٍ، وَأَبِي الرَّمَدِ البَلَوِيِّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. حَدِيثُ مُعَاوِيَةَ هَكَذَا رَوَى الثَّوْرِيُّ أَيْضًا، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَوَى ابْنُ جُرَيْجٍ، وَمَعْمَرٌ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: حَدِيثُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا أَصَحُّ، مِنْ حَدِيثِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِنَّمَا كَانَ هَذَا فِي أَوَّلِ الأَمْرِ ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ، هَكَذَا رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ فِي الرَّابِعَةِ فَاقْتُلُوهُ، قَالَ: ثُمَّ أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الخَمْرَ فِي الرَّابِعَةِ فَضَرَبَهُ وَلَمْ يَقْتُلْهُ، وَكَذَلِكَ رَوَى الزُّهْرِيُّ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا قَالَ: فَرُفِعَ القَتْلُ، وَكَانَتْ رُخْصَةً، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ لاَ نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ اخْتِلاَفًا فِي ذَلِكَ فِي القَدِيمِ وَالحَدِيثِ وَمِمَّا يُقَوِّي

هَذَا مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَوْجُهٍ كَثِيرَةٍ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ.

واتە: لە موعاویەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسیّ ئارەقی خواردەوە تا سیّ جار شەلاقی لیّ بدەن، ئەگەر بۆ چوارەم جار گەڕایەوە سەری بیکوژن).

لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە رەزای خوای لیّ بیّ، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە لەپاش ئەوە پیاوێکیان هێنا بۆ لای بۆ چوارەم جار گەڕابوەوە سەر شەراب خواردنەوە شەلاقی لێدا و نەیکوشت.

لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: (حەڵاڵ نیە خوێن رشتنی مرۆڤی موسوڵمان کە شایەتومانی بهێنیّ و بڵیّ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ). واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله)، وە منیش نێرراوی خوای گەورەم. تەنها لەم سیّ حاڵەتەدا نەبێت: زەواجی کردبێت و زینای کردبێت، گیان لەتۆڵەی گیان واتە موسڵمانێکی بە ناڕەوا کوشتبێت، یان پاشگەزبووبێتەوە لە ئیسلام و لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیابوبێتەوە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی لەسەر چەند دەستی دز دەبڕدرێت

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَمْ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ

١٤٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَتْهُ عَمْرَةُ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْطَعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا.

حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ مَرْفُوعًا، وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ مَوْقُوفًا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەر چارەکە دینارێ زیاتر دەستی دزی دەبڕی – دیناری زێڕ – .

١٤٤٦ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَطَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَيْمَنَ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، قَطَعَ فِي خَمْسَةِ دَرَاهِمَ وَرُوِيَ عَنْ عُثْمَانَ، وَعَلِيٍّ: أَنَّهُمَا قَطَعَا فِي رُبُعِ دِينَارٍ وَرُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، أَنَّهُمَا قَالاَ: تُقْطَعُ اليَدُ فِي خَمْسَةِ دَرَاهِمَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ: رَأَوْا القَطْعَ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ: لاَ قَطْعَ إِلاَّ فِي دِينَارٍ، أَوْ عَشَرَةِ دَرَاهِمَ، وَهُوَ حَدِيثٌ مُرْسَلٌ، رَوَاهُ القَاسِمُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ. وَالقَاسِمُ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ ابْنِ مَسْعُودٍ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، قَالُوا: لاَ قَطْعَ فِي أَقَلَّ مِنْ عَشَرَةِ دَرَاهِمَ. وَرُوِيَ عَنْ عَلِيٍّ أَنَّهُ قَالَ: لاَ قَطْعَ فِي أَقَلَّ مِنْ عَشَرَةِ دَرَاهِمَ. وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی دزێکی بڕی لەسەر قەڵغانێ کە نرخەکەی سێ درهەم بوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵواسینی دەستی دز

١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْلِيقِ يَدِ السَّارِقِ

١٤٤٧ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ، قَالَ: سَأَلْتُ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ عَنْ تَعْلِيقِ اليَدِ فِي عُنُقِ السَّارِقِ أَمِنَ السُّنَّةِ هُوَ؟ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَارِقٍ فَقُطِعَتْ يَدُهُ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا، فَعُلِّقَتْ فِي عُنُقِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عُمَرَ بْنِ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيِّ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُحَيْرِيزٍ هُوَ أَخُو عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ شَامِيٌّ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی موحەیریزەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پرسیارمان کرد لە (فَضَالَة)ی کوڕی عوبەید دەربارەی دز دەستی دەبڕدرێت و هەڵی ئەواسن بە ملیدا کە ئایا سوننەتە یان نا؟ (فَضَالَة) وتی: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستیان بڕی، لەپاشدا فەرمانی دا بە بڕاوی هەڵیواسن بە ملیەوە.

## دەربارەی دەست بڕین لەسەر ماڵ فڕاندن و خیانەت.

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخَائِنِ، وَالمخْتَلِسِ، وَالمنْتَهِبِ

١٤٤٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ، وَلاَ مُنْتَهِبٍ، وَلاَ مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وَقَدْ رَوَاهُ مُغِيرَةُ بْنُ مُسْلِمٍ أَخُو عَبْدِ الْعَزِيزِ الْقَسْمَلِيِّ، كَذَا قَالَ، عَلِيُّ

بْنُ الْمَدِينِيِّ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ ابْنِ جُرَيْجٍ. الْمُغِيرَةُ بْنُ مُسْلِمٍ هُوَ بَصْرِيٌّ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەستی خائین نابڕریٚت – ئەو كەسەی ئەمانەتیٚك لایەو خیانەتی لیٚ بكات ئەوە دەستی نابڕریٚت -، هەروەها دەستی ماڵ تالاّنكەر و ماڵ فڕیٚن نابڕریٚت).

## دەست نابڕدریٚ لەسەر دزینی كرۆكی خورماو بەر بەدارەوە

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ

١٤٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ. هَكَذَا رَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ رِوَايَةِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، وَرَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ.

واتە: لە رافیعی كوڕی خەدیجەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (دەست نابڕدریٚ لەسەر كرۆكی خورماو بەر بەدارەوە).

## دەربارەی لەغەزادا دەست نابڕدرێ لەسەر دزی

٢٠ – بَابُ مَا جَاءَ أَنْ لاَ تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الغَزْوِ

١٤٥٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَيَّاشِ بْنِ عَبَّاسٍ الْمِصْرِيِّ، عَنْ شُيَيْمِ بْنِ بَيْتَانَ، عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ، عَنْ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الغَزْوِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ ابْنِ لَهِيعَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَ هَذَا، وَيُقَالُ بُسْرُ بْنُ أَبِي أَرْطَاةَ أَيْضًا، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: الأَوْزَاعِيُّ: لاَ يَرَوْنَ أَنْ يُقَامَ الحَدُّ فِي الغَزْوِ بِحَضْرَةِ العَدُوِّ مَخَافَةَ أَنْ يَلْحَقَ مَنْ يُقَامُ عَلَيْهِ الحَدُّ بِالعَدُوِّ، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ مِنْ أَرْضِ الحَرْبِ وَرَجَعَ إِلَى دَارِ الإِسْلاَمِ أَقَامَ الحَدَّ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ كَذَلِكَ قَالَ الأَوْزَاعِيُّ.

واتە: لە بوسری كوڕی (أَرْطَاة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لەغەزادا دەستی دز نابڕدرێت).

## دەربارەی پیاوێ سواری كەنیزەكی هاوسەرەكەی بێ

٢١ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَقَعُ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ

١٤٥١ – (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، وَأَيُّوبَ بْنِ مِسْكِينٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ قَالَ: رُفِعَ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَجُلٌ وَقَعَ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: لأَقْضِيَنَّ فِيهَا بِقَضَاءِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَئِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ لأَجْلِدَنَّهُ مِائَةً، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَهُ رَجَمْتُهُ.

واتە: لە حەبیبی كوڕی سالیمەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ سواری كەنیزەكی ژنەكەی خۆی بوو بوو، سكالآیان بەرزكردەوە بۆ

لای نوعمانی کوڕی بەشیر رەزای خوای لێ بێ - ئەو کاتە کاربەدەستی کوفـە بـوو — فەرمووی: بەحوکم و بڕیاری پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـه وسـلم بڕیـاری بـۆ دەدەم، ئەگەر ژنەکەت بۆتی حەلاڵ کردبێ و مۆڵەتی پێ دابی ئـەوا سـەد دارت لـێ دەدەم، بەلاّم ئەگـەر ژنەکـەت بـۆتی حـەلاڵ نـەکردبێ و مۆڵـەتی پـێ نـەدابی ئـەوا بەردبارانت دەکەم. — لەپاشـدا بۆیـان دەرکـەوت کـە ژنەکـەی بـۆی حـەلاڵ کـردوەو مۆڵەتی پێ داوە، ئیتر سەد داری لێ دا- .

١٤٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ نَحْوَهُ، وَيُرْوَى عَنْ قَتَادَةَ أَنَّهُ قَالَ: كُتِبَ بِهِ إِلَى حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ. وَفِي البَابِ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبِّقِ. حَدِيثُ النُّعْمَانِ فِي إِسْنَادِهِ اضْطِرَابٌ، سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: لَمْ يَسْمَعْ قَتَادَةُ مِنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ هَذَا الحَدِيثَ إِنَّمَا رَوَاهُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ وَأَبُو بِشْرٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ هَذَا أَيْضًا، إِنَّمَا رَوَاهُ عَنْ خَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الرَّجُلِ يَقَعُ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ، فَرُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُمْ: عَلِيٌّ، وَابْنُ عُمَرَ أَنَّ عَلَيْهِ الرَّجْمَ. وقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: لَيْسَ عَلَيْهِ حَدٌّ وَلَكِنْ يُعَزَّرُ، وَذَهَبَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ إِلَى مَا رَوَى النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئافرەتێ بە زۆر زینای لەگەڵدا بکرێ

## ٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ إِذَا اسْتُكْرِهَتْ عَلَى الزِّنَا

١٤٥٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَمَّرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الرَّقِّيُّ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَبْدِ الجَبَّارِ بْنِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: اسْتُكْرِهَتْ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَدَرَأَ عَنْهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

ال حَدَّ، وَأَقَامَهُ عَلَى الَّذِي أَصَابَهَا، وَلَمْ يُذْكَرْ أَنَّهُ جَعَلَ لَهَا مَهْرًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: عَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ وَلاَ أَدْرَكَهُ، يُقَالُ: إِنَّهُ وُلِدَ بَعْدَ مَوْتِ أَبِيهِ بِأَشْهُرٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: أَنْ لَيْسَ عَلَى الْمُسْتَكْرَهَةِ حَدٌّ.

واتە: لە (عبد الجبار)ی كوڕی وائیلی كوڕی حوجرەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم پیاوێ بە زۆر زینای لەگەڵ ئافرەتێكدا كرد، حەددی شەرعی سەپان بەسەر پیاوەكەدا.

١٤٥٤ - (حسن دون قوله (أرجموه) والأرجح لم يرجموه) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سِمَاكُ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ الكِنْدِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ امْرَأَةً خَرَجَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُرِيدُ الصَّلاَةَ، فَتَلَقَّاهَا رَجُلٌ فَتَجَلَّلَهَا، فَقَضَى حَاجَتَهُ مِنْهَا، فَصَاحَتْ، فَانْطَلَقَ، وَمَرَّ عَلَيْهَا رَجُلٌ، فَقَالَتْ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ فَعَلَ بِي كَذَا وَكَذَا، وَمَرَّتْ بِعِصَابَةٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، فَقَالَتْ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ فَعَلَ بِي كَذَا وَكَذَا، فَانْطَلَقُوا، فَأَخَذُوا الرَّجُلَ الَّذِي ظَنَّتْ أَنَّهُ وَقَعَ عَلَيْهَا وَأَتَوْهَا، فَقَالَتْ: نَعَمْ هُوَ هَذَا، فَأَتَوْا بِهِ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أَمَرَ بِهِ لِيُرْجَمَ قَامَ صَاحِبُهَا الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا صَاحِبُهَا، فَقَالَ لَهَا: اذْهَبِي فَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكِ، وَقَالَ لِلرَّجُلِ قَوْلاً حَسَنًا، وَقَالَ لِلرَّجُلِ الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهَا: ارْجُمُوهُ، وَقَالَ: لَقَدْ تَابَ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا أَهْلُ الْمَدِينَةِ لَقُبِلَ مِنْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ وَعَلْقَمَةُ بْنُ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ سَمِعَ مِنْ أَبِيهِ وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْ عَبْدِ الجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، وَعَبْدُ الجَبَّارِ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە عەلقەمەی كوڕی وائیلەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئافرەتێك لەماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت بە مەبەستی نوێژكردن لەڕێگا پیاوێ ڕێی پێ گرت و بەزۆر لەگەڵی جوت بوو، ئافرەتەكە هاواری كرد، كابرا بۆی دەرچوو، پیاوێكی تر دای بەلایدا وتی: ئەم پیاوە بوو ئەوەو ئەوەی لەگەڵ كردم — پێ دەچێ شەو بوو بێت و تاریك بوو بێت - ، كۆمەڵێ لە كۆچەران دایان بەلایدا وتی: ئەم پیاوە بوو ئەوەو ئەوەی لەگەڵ كردم، ئەوانیش ڕۆشتن گرتیان و هێنایان وتی: بەڵێ ئەم پیاوە بوو، پیاوەكەیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ كە فەرمانی دا بە بەردباران كردنی، ئەو پیاوەی كە كەتنەكەی كردبوو هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من ئەو تاوانەم كردووە ئەم پیاوە نەبووە و ئاگای لێی نیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ئافرەتەكەی فەرموو: (تۆ بڕۆ بەڕاستی خوای گەورە لێت خۆش بووە). فەرمایشتێكی جوانی فەرموو بە پیاوە بێ تاوانەكە، بەو پیاوەی كە كەتنەكەی كردبوو فەرمووی: (بەردبارانی بكەن). لەپاشدا فەرمووی: (بەڕاستی تەوبەیەكی كرد ئەگەر هەموو خەڵكی مەدینە بەو شێوەیە تەوبەیان بكردایە خوای گەورە لێی وەردەگرتن و لە هەر هەموویان خۆش دەبوو).

## دەربارەی كەسێ لەگەڵ ئاژەڵدا كاری جوت بێت

٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقَعُ عَلَى البَهِيمَةِ

١٤٥٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ وَقَعَ عَلَى بَهِيمَةٍ فَاقْتُلُوهُ، وَاقْتُلُوا البَهِيمَةَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ کاری جوتبوونی لەگەڵ ئاژەڵ کرد خۆی و ئاژەڵەکەش بکوژن).

(حسن) فَقِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا شَأْنُ البَهِيمَةِ؟ قَالَ: مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ شَيْئًا، وَلَكِنْ أَرَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَرِهَ أَنْ يُؤْكَلَ مِنْ لَحْمِهَا، أَوْ يُنْتَفَعَ بِهَا، وَقَدْ عُمِلَ بِهَا ذَلِكَ العَمَلُ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ رَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي رُزَيْنٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَتَى بَهِيمَةً فَلاَ حَدَّ عَلَيْهِ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

بە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ وترا: کوشتنی ئاژەڵەکە لەبەرچی، فەرمووی: لەوبارەوە هیچم نەبیستووە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، وا ئەزانم بۆیە وای فەرموو چونکە حەزی نەکرد گۆشتی بخورێ و سوودی لێ وەربگیرێ لەبەر ئەنجامدانی ئەو کارە ناشیرینە لەگەڵیدا.

### دەربارەی حەددی شەرعی نێربازی

### ٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ اللُّوطِيِّ

١٤٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الفَاعِلَ وَالمَفْعُولَ بِهِ. وَفِي

البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَإِنَّمَا يُعْرَفُ هَذَا الحَدِيثُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَرَوَى مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، فَقَالَ: مَلْعُونٌ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ القَتْلَ، وَذَكَرَ فِيهِ مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى بَهِيمَةً. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اقْتُلُوا الفَاعِلَ وَالمَفْعُولَ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ فِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ، وَلاَ نَعْرِفُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، غَيْرَ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ العُمَرِيِّ، وَعَاصِمُ بْنُ عُمَرَ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي حَدِّ اللُّوطِيِّ، فَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنَّ عَلَيْهِ الرَّجْمَ أَحْصَنَ أَوْ لَمْ يُحْصِنْ، وَهَذَا قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ فُقَهَاءِ التَّابِعِينَ مِنْهُمْ: الحَسَنُ البَصْرِيُّ، وَإِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ، وَعَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَغَيْرُهُمْ، قَالُوا: حَدُّ اللُّوطِيِّ حَدُّ الزَّانِي، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دیتان كەسێك نێربازی دەكات بكەر و بدەر هەردوكیان بكوژن).

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر حەددی شەرعی نێربازی، هەندێكیان پێیان وایە بەردباران بكرێ ئیتر هاوسەرگیری كردبێ یان نا، ئەمەش وتەی پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. هەندێ لە زانایان لە شوێنكەوتوان لەوانە: حەسەنی بەصری و ئیبراهیمی نەخەعی و (عطاء)ی كوڕی ئەبو ڕەباح و جگە لەوانیش دەفەرموون: حەددی شەرعی نێربازی وەك حەددی شەرعی زینا وایە، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (ثوري) و خەڵكی كوفەیە.

١٤٥٧ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الوَاحِدِ الْمَكِّيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا

يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ جَابِرٍ.

**واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی کە من زۆر لێی دەترسم لەبارەی ئوممەتەکەمەوە بڵاوبوونەوەی کاری نێربازییە لەناویاندا).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵگەڕاوە لە دین

### ٢٥- بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُرْتَدِّ

١٤٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ عَلِيًّا حَرَّقَ قَوْمًا ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلَامِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَقَتَلْتُهُمْ بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ. وَلَمْ أَكُنْ لأُحَرِّقَهُمْ لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللهِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عَلِيًّا، فَقَالَ: صَدَقَ ابْنُ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي الْمُرْتَدِّ، وَاخْتَلَفُوا فِي الْمَرْأَةِ إِذَا ارْتَدَّتْ عَنِ الإِسْلَامِ، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: تُقْتَلُ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: تُحْبَسُ وَلاَ تُقْتَلُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَغَيْرِهِ مِنْ أَهْلِ الكُوفَةِ.

**واتە: لە عیکرەمەوە دەگێرنەوە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ خەڵکانێکی سوتاند بە ئاگر کە پاشگەزبووبوونەوە لە ئیسلام، هەواڵەکە گەیشتەوە بە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: ئەگەر من لەجێی ئەوبوومایە دەمکوشتن، لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە**

فەرموویەتی: (هەرکەس دینی خۆی گۆڕی و لە ئیسلام پاشگەزبوویەوە بیکوژن) ، نەدەبوو بە ئاگر بیانسوتێنیّ، لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم: (بە سزای تایبەتی خوای گەورە سزای خەڵك مەدەن کە بریتیە سوتاندن). جا کە هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێشەوا عەلی فەرمووی: ئیبنو عەباس راست دەکات.

هەندێ لە زانایان پەیڕەوی ئەمە دەکەن سەبارەت بە حوکمی هەڵگەڕاوە لە دین، بەڵام رایان جیاوازە لەسەر ئافرەت کاتیّ لە ئیسلام پاشگەزبێتەوە، هەندێ لە زۆربەی زانایان دەفەرموون: دەکوژرێت، ئەمەش وتەی پێشەوایان ئەوزاعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی تریان دەفەرموون: زیندانی دەکرێت و ناکوژرێت، ئەمەش وتەی پێشەوا سوفیانی (ثوري) و جگە لەوە لەخەڵکی کوفە.

## دەربارەی ئەوەی چەك هەڵدەگریّ بۆ دژایەتی موسوڵمانان

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ شَهَرَ السِّلاَحَ

١٤٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَأَبُو السَّائِبِ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ. حَدِيثُ أَبِي مُوسَى حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوکەسەی لەدژی ئێمە چەك هەڵگریّ ئەوە لەسەر رێباز و سوننەتی ئێمە نییە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی حەددی شەرعی جادووگەر

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ السَّاحِرِ

١٤٦٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ جُنْدُبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حَدُّ السَّاحِرِ ضَرْبَةٌ بِالسَّيْفِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ الْمَكِّيُّ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ العَبْدِيُّ البَصْرِيُّ قَالَ: وَكِيعٌ هُوَ ثِقَةٌ وَيَرْوِي عَنِ الْحَسَنِ أَيْضًا، وَالصَّحِيحُ عَنْ جُنْدَبٍ مَوْقُوفًا وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ وقَالَ الشَّافِعِيُّ: إِنَّمَا يُقْتَلُ السَّاحِرُ إِذَا كَانَ يَعْمَلُ فِي سِحْرِهِ مَا يَبْلُغُ بِهِ الكُفْرَ، فَإِذَا عَمِلَ عَمَلاً دُونَ الكُفْرِ فَلَمْ نَرَ عَلَيْهِ قَتْلاً.

واتـە: لـە جوندوبـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (حـەددی شـەرعی سـاحیر و جادووگەر دان لە ملیەتی بە شمشێر).

## دەربارەی کەسێ دزی بکات لە غەنیمەت

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغَالِّ مَا يُصْنَعُ بِهِ

١٤٦١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو السَّوَّاقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ زَائِدَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللهِ فَاحْرِقُوا مَتَاعَهُ قَالَ صَالِحٌ: فَدَخَلْتُ عَلَى مَسْلَمَةَ وَمَعَهُ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، فَوَجَدَ رَجُلاً قَدْ غَلَّ، فَحَدَّثَ سَالِمٌ بِهَذَا الحَدِيثِ، فَأَمَرَ بِهِ، فَأُحْرِقَ مَتَاعُهُ، فَوُجِدَ فِي مَتَاعِهِ مُصْحَفٌ، فَقَالَ سَالِمٌ: بِعْ هَذَا وَتَصَدَّقْ بِثَمَنِهِ. هَذَا الحَدِيثُ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ

هَذَا الوَجْهِ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: إِنَّمَا رَوَى هَذَا صَالِحُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَائِدَةَ، وَهُوَ أَبُو وَاقِدٍ اللَّيْثِيُّ وَهُوَ مُنْكَرُ الحَدِيثِ، قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَدْ رُوِيَ فِي غَيْرِ حَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الغَالِّ، فَلَمْ يَأْمُرْ فِيهِ بِحَرْقِ مَتَاعِهِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان دی دزی کردبوو لە غەنیمەت کەل و پەلەکەی بسوتێنن). صالح فەرمووی: چووم بۆ خزمەت مەسلەمە سالمی کوڕی (عبد الله)یش رەزای خوای لێ بێ لەوێ بوو، پیاوێکیان دی دزی کردبوو لە غەنیمەت، سالم ئەم فەرموودەی گێڕایەوە، فەرمانی کرد کەل و پەلەکەی بسوتێنن، لەناو کەل و پەلەکەیدا موصحەفێکیان دۆزیەوە، سالم رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەم موصحەفە بفرۆشن و پارەکەی بکەن بە خێر.

### دەربارەی کەسێ بە پیاوێ بڵێ: ئەی ژنانی

### ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقُولُ لِآخَرَ: يَا مُخَنَّثُ

١٤٦٢ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَبِيبَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ الحُصَيْنِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: يَا يَهُودِيُّ، فَاضْرِبُوهُ عِشْرِينَ، وَإِذَا قَالَ: يَا مُخَنَّثُ، فَاضْرِبُوهُ عِشْرِينَ، وَمَنْ وَقَعَ عَلَى ذَاتِ مَحْرَمٍ فَاقْتُلُوهُ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ رَوَاهُ البَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ، وَقُرَّةُ بْنُ إِيَاسٍ الْمُزَنِيُّ، أَنَّ رَجُلاً تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِهِ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ

أَصْحَابِنَا، قَالُوا: مَنْ أَتَى ذَاتَ مَحْرَمٍ وَهُوَ يَعْلَمُ فَعَلَيْهِ القَتْلُ وقَالَ أَحْمَدُ: مَنْ تَزَوَّجَ أُمَّهُ قُتِلَ. وقَالَ إِسْحَاقُ: مَنْ وَقَعَ عَلَى ذَاتِ مَحْرَمٍ قُتِلَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ بە کەسێکی موسوڵمان بڵێ: ئەی جولەکە – ئەی گاور، ئەی کافر – ئەوە دە شەلاقی لێ بدەن، ئەگەر بە پیاوێ بڵێ: ئەی ژنانی ئەوە دە شەلاقی لێ بدەن، ئەوەی بە ئەنقەست کاری جوتبوون بکات لەگەڵ مەحرەمێکی خۆی – وەك دایك و خوشك و کچ و پوری خۆی – ئەوە بیکوژن).

لە بەرائی کوڕی عازیب و قورەی کوڕی ئیاسی موزەنیەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ ژنەکەی باوکی مارەکرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە کوشتنی.

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هاوەڵانمان دەفەرموون: ئەوەی کاری جوتبوون بکات لەگەڵ مەحرەمێکی خۆی و بزانێ ئەو کارە حەرامە دەبێ بکوژرێ. پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێت: ئەوەی دایکی مارەبکات دەبێ بکوژرێ. پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: ئەوەی کاری جوتبوون بکات لەگەڵ مەحرەمێکی خۆی دەبێ بکوژرێت.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی تەمێ کردن.

٣٠ – بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّعْزِيرِ

١٤٦٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ

عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ بُكَيْرِ بْنِ الأَشَجِّ. وَقَدِ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي التَّعْزِيرِ، وَأَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي التَّعْزِيرِ هَذَا الحَدِيثُ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ بُكَيْرٍ، فَأَخْطَأَ فِيهِ، وَقَالَ: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ خَطَأٌ، وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، إِنَّمَا هُوَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو بوردەی کوڕی نیارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە دە دار زیاتر لە کەس نادرێت مەگەر لەسەر حەددێکی شەرعی).

# باسەكانی راوكردن لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ١٦ - أَبْوَابُ الصَّيْدِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### دەربارەی نێچیری سەگ كامەی گۆشتەكەی دەخورێ و كامەی ناخورێ

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُؤْكَلُ مِنْ صَيْدِ الكَلْبِ وَمَا لاَ يُؤْكَلُ

١٤٦٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ. وَالحَجَّاجُ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ أَبِي مَالِكٍ، عَنْ عَائِذِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيَّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا أَهْلُ صَيْدٍ، قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ، فَأَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلَ، قُلْتُ: إِنَّا أَهْلُ رَمْيٍ، قَالَ: مَا رَدَّتْ عَلَيْكَ قَوْسُكَ فَكُلْ قَالَ: قُلْتُ: إِنَّا أَهْلُ سَفَرٍ نَمُرُّ بِاليَهُودِ، وَالنَّصَارَى، وَالمجُوسِ، فَلاَ نَجِدُ غَيْرَ آنِيَتِهِمْ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا غَيْرَهَا فَاغْسِلُوهَا بِالماءِ، ثُمَّ كُلُوا فِيهَا وَاشْرَبُوا. وَفِي البَابِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَعَائِذُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ هُوَ أَبُو إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيُّ، وَاسْمُ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ جُرْثُومٌ، وَيُقَالُ: جُرْثُمُ بْنُ نَاشِمٍ، وَيُقَالُ: ابْنُ قَيْسٍ.

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمە خەڵكانێكی راوچین، فەرمووی: (ئەگەر سەگە راوكەرە راهێنراوەكەت ئاراستەی نێچیرەكە كردو، ناوی خودات هێنا، ئەوەی بۆ تۆی راو دەكات لێی بخۆ)، وتم: ئەی ئەگەر كوشتی؟ فەرمووی: (ئەگەر كوشتیشی هەر لێی بخۆ)، وتم: ئەی ئێمە خەڵكانێكی تیرهاوێژین و ئەهلی

رەمی كردنین، فەرمووی: (هەر شتێك كەوانەكەت بۆت بگێڕێتـەوە لێـی بخـۆ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمـە خـەڵكانێكین سـەفەر زۆر دەكـەین دەدەین بەلای جولەكەو گاور و ئاگرپەرستەكاندا جگـە لـە دەفـر و قـاپ و قاچاخی ئەوانمان دەست ناكەوێت خواردنیان تێدا بخۆین، فەرمووی: (ئەگەر ناچار بـوون دەفـر و قاپ و قاچاخی ئەوان بەكاربهێنن بە ئاو بیشۆن و بەكاریان بهێـنن بـۆ خـواردن و خواردنەوە).

١٤٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نُرْسِلُ كِلاَبًا لَنَا مُعَلَّمَةً، قَالَ: كُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ، مَا لَمْ يَشْرَكْهَا كَلْبٌ غَيْرُهَا، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرْمِي بِالمِعْرَاضِ، قَالَ: مَا خَزَقَ فَكُلْ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ نَحْوَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: وَسُئِلَ عَنِ الْمِعْرَاضِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە عـەدی كـوڕی حاتیمـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من سەگی راوكەری راهێنراو ئاراستەی نێچیر دەكەم دەیگرن بۆم، ئایا گۆشتەكەی حەڵاڵـەو لێـی بخـۆم؟ فەرمووی: (ئەگەر سەگە راوكەرەكەت ئاراستەی نێچیرەكە كردو ناوی خودات هێنـا ئەویش نێچیرەكەی گرت، ئەوە بۆتـۆی دەگـرێ بیخـۆ)، وتم: ئـەی ئـەگـەر نێچـیرەكە بكوژێ؟ فەرمووی: (ئەگەر بیشیكوژێ، بەمەرجێ سەگێكی تر هاوبەشـی نـەكردبێ لە گرتنیدا — نەوەك ئەو سەگە كوشتبێتی). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صـلی

الله علیه وسلم، ئەگەر بە (معراض)[1] تیرێکی بێ پەڕە نێچیری پێ راوبکەم ئایا گۆشتی نێچیرەکە حەلاڵەو لێی بخۆم؟ فەرمووی: (ئەگەر ناوی خوات لەسەر هێناو، لەسەر باری تیژی لێی بدات ئەوە گۆشتەکەی حەلاڵەو لێی بخۆ، بەلاّم ئەگەر لەسەر باری پانی لێی بدات ئەوە لێی مەخۆ چونکە ئەوە بە زەبر مرداربۆتەوە).

## دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیری سەگی راوکەری ئاگرپەرست

### ٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ كَلْبِ الْمَجُوسِ

١٤٦٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنِ الحَجَّاجِ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ أَبِي بَزَّةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ اليَشْكُرِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: نُهِينَا عَنْ صَيْدِ كَلْبِ الْمَجُوسِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ لاَ يُرَخِّصُونَ فِي صَيْدِ كَلْبِ الْمَجُوسِ، وَالقَاسِمُ بْنُ أَبِي بَزَّةَ هُوَ القَاسِمُ بْنُ نَافِعٍ الْمَكِّيُّ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خواردنی گۆشتی نێچیری سەگی راوکەری ئاگرپەرستمان لێ قەدەغەکراوە.

---

(١) (معراض) بریتیە: لە تیرێکی بێ پەڕ یان تەختەیەکی قورسە یا عصایەك ئاسنێك بەسەرەکەیەوەتی یان جگە لە ئاسن.

## دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیری باز

### ٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ البُزَاةِ

١٤٦٧ - (منكر) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، وَهَنَّادٌ، وَأَبُو عَمَّارٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَيْدِ البَازِي، فَقَالَ: مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، لاَ يَرَوْنَ بِصَيْدِ البُزَاةِ، وَالصُّقُورِ بَأْسًا وَقَالَ مُجَاهِدٌ: البُزَاةُ: هُوَ الطَّيْرُ الَّذِي يُصَادُ بِهِ مِنَ الجَوَارِحِ الَّتِي قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الجَوَارِحِ)، فَسَّرَ الكِلاَبَ وَالطَّيْرَ الَّذِي يُصَادُ بِهِ وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي صَيْدِ البَازِي، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ، وَقَالُوا: إِنَّمَا تَعْلِيمُهُ إِجَابَتُهُ، وَكَرِهَهُ بَعْضُهُمْ، وَالفُقَهَاءُ أَكْثَرُهُمْ قَالُوا: نَأْكُلُ وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیرێ کە باز ڕاوی بکات پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەوەی بۆتۆ دەیگرێ لێی بخۆ).

## دەربارەی کەسێ نێچیرێ بپێکێ و لێی ون بێ

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَغِيبُ عَنْهُ

١٤٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ يُحَدِّثُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، أَرْمِي الصَّيْدَ فَأَجِدُ فِيهِ مِنَ الغَدِ سَهْمِي؟ قَالَ: إِذَا عَلِمْتَ أَنَّ سَهْمَكَ قَتَلَهُ وَلَمْ تَرَ فِيهِ أَثَرَ سَبُعٍ فَكُلْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، وَعَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنْ

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ مِثْلَهُ، وَكِلاَ الْحَدِيثَيْنِ صَحِيحٌ وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، تیر دەگرمە نێچیرێك و دەیپێکم شوێنی هەڵدەگرم، بۆ ڕۆژی دواتر دەبینم بە مردوویی تیرەکەی منی پێوەیە ئایا لە گۆشتەکەی بخۆم یان نا؟ فەرمووی: (ئەگەر زانیت تیرەکەی تۆ کوشتویەتی و شوێنەواری دڕندەی پێوە دیار نەبوو ئەوە لێی بخۆ).

## دەربارەی کەسێ نێچیرێ بپێکێ بە مردوویی لەناو ئاودا بیدۆزێتەوە

## ٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَجِدُهُ مَيِّتًا فِي الْمَاءِ

١٤٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللهِ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قُتِلَ فَكُلْ إِلاَّ أَنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیرێ کە ڕاو بکرێت پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (کاتێ تیرەکەت تێ گرت، ناوی خوای لەسەر بهێنە، ئەگەر بەمردوویی دۆزیتەوە لێی بخۆ، خۆ ئەگەر لەناودا دۆزیتەوە لێی مەخۆ چونکە تۆ نازانی تیرەکەی تۆ کوشتویەتی یان لە ئاوەکەدا خنکاوە).

## دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیرێ سەگ لێی بخوات

## ٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَلْبِ يَأْكُلُ مِنَ الصَّيْدِ

١٤٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَيْدِ الكَلْبِ الْمُعَلَّمِ، قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ فَكُلْ مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ، فَإِنْ أَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ خَالَطَتْ كِلاَبَنَا كِلاَبٌ أُخَرُ؟ قَالَ: إِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تَذْكُرْ عَلَى غَيْرِهِ قَالَ سُفْيَانُ: أَكْرَهُ لَهُ أَكْلَهُ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي الصَّيْدِ وَالذَّبِيحَةِ إِذَا وَقَعَا فِي الْمَاءِ أَنْ لاَ يَأْكُلَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فِي الذَّبِيحَةِ إِذَا قُطِعَ الحُلْقُومُ فَوَقَعَ فِي الْمَاءِ فَمَاتَ فِيهِ فَإِنَّهُ يُؤْكَلُ، وَهُوَ قَوْلُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الكَلْبِ إِذَا أَكَلَ مِنَ الصَّيْدِ، فَقَالَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا أَكَلَ الكَلْبُ مِنْهُ فَلاَ تَأْكُلْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ فِي الأَكْلِ مِنْهُ وَإِنْ أَكَلَ الكَلْبُ مِنْهُ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیرێ کە سەگی ڕاهێنراو ڕاوی بکات پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەگەر سەگە ڕاوکەرەکەت ئاراستەی نێچیرەکە کردو ناوی خودات لێ هێنا ئەویش نێچیرەکەی گرت، ئەوەی بۆتۆی دەگرێ بیخۆ، بەلاّم ئەگەر لێی خوارد تۆ لێی مەخۆ چونکە ئەوە بۆ خۆی ڕاوکردووە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەگی تر هاوبەشی سەگەکانمان دەکات لەکاتی ڕاوکردندا؟ فەرمووی: (تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، نەك سەگی تر).

## خواردنی گۆشتی نێچیرێ کە بە (معراض) راو بکرێت

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ الْمِعْرَاضِ

١٤٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: مَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَكَرِيَّا، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیرێ کە راو بکرێت بە (معراض) تیرێکی بێ پەڕە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەگەر ناوی خوات لەسەر هێنا، وە لەسەر باری تیژی لێی بدات ئەوە گۆشتەکەی حەڵاڵەو لێی بخۆ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی لێی بدات ئەوە لێی مەخۆ چونکە ئەوە بە زەبر مرداربۆتەوە).

# نامەی سەربڕاوەکان

# كِتَابُ الذَّبَائِحِ

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو ئاژەڵانەی لە مەروە سەردەبڕرێن

## ١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الذَّبِيحَةِ بِالْمَرْوَةِ

١٤٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى القُطَعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ قَوْمِهِ صَادَ أَرْنَبًا أَوْ اثْنَيْنِ، فَذَبَحَهُمَا بِمَرْوَةٍ، فَتَعَلَّقَهُمَا، حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَهُ، فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهِمَا. وَفِي البَابِ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ، وَرَافِعٍ، وَعَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ. وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي أَنْ يُذَكِّيَ بِمَرْوَةٍ، وَلَمْ يَرَوْا بِأَكْلِ الأَرْنَبِ بَأْسًا، وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وَقَدْ كَرِهَ بَعْضُهُمْ أَكْلَ الأَرْنَبِ، وَاخْتَلَفَ أَصْحَابُ الشَّعْبِيِّ فِي رِوَايَةِ هَذَا الحَدِيثِ فَرَوَى دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ وَرَوَى عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ أَوْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ صَفْوَانَ أَصَحُّ وَرَوَى جَابِرٌ الجُعْفِيُّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ نَحْوَ حَدِيثِ قَتَادَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ وَيُحْتَمَلُ أَنَّ الشَّعْبِيَّ رَوَى عَنْهُمَا جَمِيعًا. قَالَ مُحَمَّدٌ: حَدِيثُ الشَّعْبِيِّ عَنْ جَابِرٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە هۆزەکەی یەك دوو کەروێشکی ڕاوکرد لە مەروە سەری بڕین و هەڵی گرتن هەتا گەیشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوبارەوە لێی پرسی، فەرمانی پێ کرد لە گۆشتەکەیان بخوات.

عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَوَاهُ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باشترین هاوڕێ ئەوانەن کە ژمارەیان چوار کەسە، باشترین سریەش ئەوەیە کە ژمارەیان چوار سەد کەسە، باشترین سوپاش ئەوەیە کە ژمارەیان چوار هەزار کەسە، هەرکاتێ ژمارەیان گەیشتە دوانزە هەزار کەس ئیتر لەبەر کەمی ژمارەیان نابەزن).

## دەستکەوتنی ماڵی کافران بەبێ جەنگ بەکێ دەدرێت

### ٨ - بَابُ مَنْ يُعْطَى الفَيْءَ

١٥٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ هُرْمُزَ، أَنَّ نَجْدَةَ الحَرُورِيَّ كَتَبَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ، هَلْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْزُو بِالنِّسَاءِ؟ وَهَلْ كَانَ يَضْرِبُ لَهُنَّ بِسَهْمٍ؟ فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَتَبْتَ إِلَيَّ تَسْأَلُنِي هَلْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْزُو بِالنِّسَاءِ، وَكَانَ يَغْزُو بِهِنَّ، فَيُدَاوِينَ الْمَرْضَى، وَيُحْذَيْنَ مِنَ الغَنِيمَةِ، وَأَمَّا يُسْهِمُ، فَلَمْ يَضْرِبْ لَهُنَّ بِسَهْمٍ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی هورمزەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نەجدەی حەروری نامەی نوسی بۆ ئیبنو عەباس دەربارەی ئافرەتان پرسیاری لێ کرد: کە ئایا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئافرەتان بەشداری جەنگیان دەکرد؟ وە ئایا لەدەستکەوتی جەنگی پشك و بەشی بۆ دادەنان؟ ئیبنو عەباس وەڵامی نامەکەی بەم شێوەیە بۆ نووسیەوە: بەڵێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم بەشداری جەنگی پێ دەکردن تەداوی نەخۆشیان دەکرد، لەدەستکەوتی جەنگی بەشی دەدان، بەڵام وەك پیاوان پشکی بۆ دانەدەنان.

(صحيح الإسناد مقطوع) وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَأُمِّ عَطِيَّةَ . وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُسْهَمُ لِلْمَرْأَةِ وَالصَّبِيِّ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ. قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: وَأَسْهَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلصِّبْيَانِ بِخَيْبَرَ، وَأَسْهَمَتْ أَئِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ لِكُلِّ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي أَرْضِ الحَرْبِ. قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: وَأَسْهَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلنِّسَاءِ بِخَيْبَرَ، وَأَخَذَ بِذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ بَعْدَهُ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ بِهَذَا. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: وَيُحْذَيْنَ مِنَ الغَنِيمَةِ، يَقُولُ: يُرْضَخُ لَهُنَّ بِشَيْءٍ مِنَ الغَنِيمَةِ يُعْطَيْنَ شَيْئًا.

زۆربەی زانایان پەیڕەوی فەرموودەکە دەکەن، ئەمەش وتەی پێشەوایان سوفیانی (ثوري) و شافیعیيە، هەندێکی تریان دەفەرموون: پشك دادەنرێت بۆ ئافرەت و منداڵ، ئەمەش وتەی پێشەوا ئەوزاعییە، پێشەوا ئەوزاعی دەفەرمووێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە دەستکەوتی خەیبەر پشکی دانا بۆ منداڵان، هەر منداڵێ لە خاکی جەنگدا لەدایك ببوایە پێشەوای موسوڵمانان پشکی بۆ دادەنا، پێشەوا ئەوزاعی دەفەرمووێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە دەستکەوتی خەیبەر پشکی دانا بۆ ئافرەتان، موسوڵمانانیش دەستیان پێوەگرت و بەو شێوەیان دەکرد.

## دەربارەی ئایا پشك دادەنرێت بۆ بەندە یان نا؟

## ٩ - بَابُ هَلْ يُسْهَمُ لِلْعَبْدِ؟

١٥٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عُمَيْرٍ، مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ قَالَ: شَهِدْتُ خَيْبَرَ مَعَ سَادَتِي، فَكَلَّمُوا فِيَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَلَّمُوهُ أَنِّي مَمْلُوكٌ، قَالَ: فَأَمَرَ بِي، فَقُلِّدْتُ السَّيْفَ، فَإِذَا أَنَا أَجُرُّهُ، فَأَمَرَ لِي بِشَيْءٍ مِنْ خُرْثِيِّ الْمَتَاعِ، وَعَرَضْتُ عَلَيْهِ رُقْيَةً كُنْتُ أَرْقِي بِهَا الْمَجَانِينَ، فَأَمَرَنِي بِطَرْحِ بَعْضِهَا، وَحَبْسِ بَعْضِهَا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، لاَ يُسْهَمُ لِلْمَمْلُوكِ، وَلَكِنْ يُرْضَخُ لَهُ بِشَيْءٍ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە عومەیری بەندەی ئازادکراوی (آبي اللحم)ەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ گەورەکانی ئەهلەکەم ئامادەی غەزای بەدر بووین، جا لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم گفتوگۆیان کرد دەربارەی بەشداری کردنم لەغەزاکەو حەقی من و بەشم لە غەنیمەتەکە، ئەویش فەرمانی کرد شمشێرێکیان دامێ بۆ ئەوەی کە بەشداری جەنگەکە بکەم و فێری هونەری جەنگی ببم، شمشێرەکەم کردە شان بەڵام لەبەر بچوکی تەمەنم و کورتی قەدو باڵام بەشوێنی خۆمدا شمشێرەکەم رادەکێشا، بە پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم راگەیاند کە کۆیلەم، کاتێ کە غەنیمەتەکەیان دابەشکرد فەرمانی کرد هەندێ کەل وپەلی ناوماڵیان پێ بەخشیم. هەندێ نوشتەم نیشانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دا کاتی خۆی دەمنووسی بۆ شێتەکان، ئەویش هەندێ وشەی لێ فرێدان کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو، هەندێکی لێ هێشتنەوە.

## ئەگەر ئەهلی (ذمة) هاوکاری موسوڵمانانیان کرد پشکیان بۆ دادەنرێ یان نا؟

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَهْلِ الذِّمَّةِ يَغْزُونَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ هَلْ يُسْهَمُ لَهُمْ؟

١٥٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ الفُضَيْلِ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ نِيَارٍ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ إِلَى بَدْرٍ حَتَّى إِذَا كَانَ بِحَرَّةِ الوَبَرَةِ لَحِقَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يَذْكُرُ مِنْهُ جُرْأَةً وَنَجْدَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ؟، قَالَ: لاَ، قَالَ: ارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ. وَفِي الحَدِيثِ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: لاَ يُسْهَمُ لأَهْلِ الذِّمَّةِ، وَإِنْ قَاتَلُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ العَدُوَّ. وَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يُسْهَمَ لَهُمْ إِذَا شَهِدُوا القِتَالَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ. وَيُرْوَى عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْهَمَ لِقَوْمٍ مِنَ اليَهُودِ قَاتَلُوا مَعَهُ حَدَّثَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَزْرَةَ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ جەنگی بەدر ڕۆشت هەتا گەیشتە (حَرَّةِ الوَبَرَةِ) — شوێنێکە چوار میل لە مەدینەوە دوورە - ، پیاوێکی ئازا لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران خۆی گەیاندێ و پەیوەندی کرد بە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی لەخزمەتیدا بجەنگێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (باوەڕ ئەهێنی بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی بگەڕێرەوە ئێمە پشت نابەستین بە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر و پێویستمان بە یارمەتی تۆ نیە).

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەهلی (ذمة)

پشکیان بۆ دانانرێت، هەرچەندە بەشداری جەنگ بکەن بەرامبەر بە دوژمن و هاوکاری موسوڵمانان بکەن، هەندێ لە زانایان رایان وایە: ئەگەر بەشداری جەنگ بکەن و هاوکاری موسوڵمانان بکەن پشکیان بۆ دادەنرێت. لە زوهریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پشکی دانا بۆ کۆمەڵێ جولەکە کە بەشداری جەنگیان کرد بەرامبەر بە دوژمن و هاوکاری موسوڵمانانیان کرد.

١٥٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا مَعَ الَّذِينَ افْتَتَحُوهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ. قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: مَنْ لَحِقَ بِالمسْلِمِينَ قَبْلَ أَنْ يُسْهَمَ لِلْخَيْلِ أُسْهِمَ لَهُ وَبُرَيْدٌ يُكْنَى أَبَا بُرْدَةَ وَهُوَ ثِقَةٌ، وَرَوَى عَنْهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُهُمَا.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێ لە هۆزی ئەشعەریەکان گەیشتم بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە خەیبەر، پشکی بۆ ئێمەش دانا لەگەڵ ئەوانەی کە رزگاریان کردبوو. پێشەوا ئەوزاعی دەفەرمووێ: هەرکەس بگات بە موسوڵمانان لەپێش ئەوەی پشکی ئەسپ دابنرێت ئەوە پشکی بۆ دادەنرێت.

## سوودوەرگرتن لە قاپ و قاچاخی هاوبەش بۆ خوا بڕیردەران

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِنْتِفَاعِ بِآنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ

١٥٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ، قَالَ:

سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قُدُورِ الْمَجُوسِ، فَقَالَ: أَنْقُوهَا غَسْلاً، وَاطْبُخُوا فِيهَا، وَنَهَى عَنْ كُلِّ سَبُعٍ ذِي نَابٍ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ، وَرَوَاهُ أَبُو إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيُّ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ وَأَبُو قِلاَبَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ، إِنَّمَا رَوَاهُ عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ.

واتە: لە ئەبو (ثَعْلَبَة)ی خوشەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە بەکارهێنانی مەنجەڵ و قابلەمەی ئاگر پەرستان پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش فەرمووی: (بە شۆردن پاکی بکەنەوە و چێشتی تێدا بکوڵێنن و بیخۆن، هەروەها نەهی کردووە لە خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیە کەڵبەی هەبێ و گۆشتی مردارەوە بوو بخوات).

١٥٦٠ (م) – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَبِيعَةَ بْنَ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيَّ، يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيُّ عَائِذُ اللهِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيَّ، يَقُولُ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ نَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، قَالَ: إِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَ آنِيَتِهِمْ فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو (ثَعْلَبَة)ی خوشەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئێمە لە خاکی گەلێك داین خاوەن نامەی ئاسمانین لە قاپ و قاچاخی ئەواندا دەخۆین و دەخۆینەوە، فەرمووی: (ئەگەر قاپ و قاچاخی غەیری ئەوانتان دەستکەوت ئەوە لە قاپ و قاچاخی ئەواندا مەخۆن و مەخۆنەوە، ئەگەر دەستیشتان نەکەوت ئەوا بیانشۆن و بەکاریان بهێنن بۆ خواردن و خواردنەوە).

## زیاتر دانان لە بەشی دەستکەوتی جەنگدا

## ١٢ - بَابٌ فِي النَّفَلِ

١٥٦١ - (صحيح) حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ أَبِي سَلاَّمٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُنَفِّلُ فِي البَدْأَةِ الرُّبُعَ، وَفِي القُفُولِ الثُّلُثَ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَحَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ، وَمَعْنِ بْنِ يَزِيدَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ. وَحَدِيثُ عُبَادَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَبِي سَلاَّمٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم جاری وا هەبووە لەدوای لێ دەرکردنی پێنج یەك لە دەستکەوتی جەنگی چارەکە بەشێك زیادەی دەدا بە هەندێ، هەروەها لەکاتی گەڕانەوەشدا سێیەکی دەدا بە هەندێك.

١٥٦١ (م) - (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَنَفَّلَ سَيْفَهُ ذَاالفَقَارِ يَوْمَ بَدْرٍ، وَهُوَ الَّذِي رَأَى فِيهِ الرُّؤْيَا يَوْمَ أُحُدٍ، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي الزِّنَادِ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي النَّفَلِ مِنَ الخُمُسِ فَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: لَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَفَّلَ فِي مَغَازِيهِ كُلِّهَا. وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّهُ نَفَّلَ فِي بَعْضِهَا، وَإِنَّمَا ذَلِكَ عَلَى وَجْهِ الاجْتِهَادِ مِنَ الإِمَامِ فِي أَوَّلِ الْمَغْنَمِ وَآخِرِهِ قَالَ ابْنُ مَنْصُورٍ: قُلْتُ لأَحْمَدَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَفَّلَ إِذَا فَصَلَ بِالرُّبُعِ بَعْدَ الخُمُسِ، وَإِذَا قَفَلَ بِالثُّلُثِ بَعْدَ الخُمُسِ، فَقَالَ: يُخْرِجُ

الخُمُسَ ثُمَّ يُنَفِّلُ مِمَّا بَقِيَ وَلاَ يُجَاوِزُ هَذَا. وَهَذَا الحَدِيثُ عَلَى مَا قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ النَّفَلُ مِنَ الخُمُسِ، قَالَ إِسْحَاقُ كَمَا قَالَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆژی جەنگی بەدر وەك زیادە بەش شمشێرەکەی وەرگرت کە بە (ذَا الفَقَارِ) بەناوبانگ بوو، خەوی پێوە دی بوو ڕۆژی جەنگی ئوحود.

زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر پێنج یەك، پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس دەفەرمووێ: پێم نەگەیشتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هەموو غەزاکاندا زیادە بەشی دابێت، بەڵام پێم گەیشتووە لە هەندێ غەزاکاندا زیادە بەشی داوە لەڕووی ئیجتیهادی پێشەواوە لە سەرەتاو کۆتایی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگەوە. ئیبنو مەنصور دەفەرمووێ: بە پێشەوا ئەحمەدم وت: ئایا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زیادە بەشی دەدا لەدوای جیاکردنەوەی چوار یەك و پێنج یەك، هەروەها سێ یەکی دەدا لە کۆتاییەوە لەدوای پێنج یەك؟ فەرمووی: پێنج یەکی دەردەکرد، جا لەوەی کە دەمایەوە زیادەبەشی لێ دەدا، لەوە زیاتر تێ نەدەپەڕی.

## هەرکەسێ کافرێ بکوژێ کەل و پەلەکەی بۆ ئەو دەبێ

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ

١٥٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ كَثِيرِ بْنِ أَفْلَحَ، عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ، مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ. وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ کافرێ بکوژێ و بەڵگەی هەبێ ئەوە کەل و پەل و کەرەسەی جەنگ و ئەسپی کوژراوەکە بۆ ئەو کەسە دەبێ کە کوشتوویەتی).

١٥٦٢ (م) - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَفِي البَاب عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ، وَخَالِدِ بْنِ الوَلِيدِ، وَأَنَسٍ، وَسَمُرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو مُحَمَّدٍ هُوَ نَافِعٌ مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لِلإِمَامِ أَنْ يُخْرِجَ مِنَ السَّلَبِ الخُمُسَ وقَالَ الثَّوْرِيُّ: النَّفَلُ أَنْ يَقُولَ الإِمَامُ: مَنْ أَصَابَ شَيْئًا فَهُوَ لَهُ، وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ، فَهُوَ جَائِزٌ، وَلَيْسَ فِيهِ الخُمُسُ. وقَالَ إِسْحَاقُ: السَّلَبُ لِلْقَاتِلِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ شَيْئًا كَثِيرًا فَرَأَى الإِمَامُ أَنْ يُخْرِجَ مِنْهُ الخُمُسَ، كَمَا فَعَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ.

پێشەوا ئیسحاق دەفەرمووێ: کەل و پەلی کوژراو بۆ بکوژەکەی دەبێت مەگەر شتێکی زۆر بێت، پێشەوا پێی باش بێ پێنج یەکی لێ دەربکرێت، هەروەك چۆن پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ کردی.

## فرۆشتنی دەستکەوتی جەنگی دروست نیە لەپێش دابەشکردنی

### ١٤ - بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ بَيْعِ الْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ

١٥٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جَهْضَمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شِرَاءِ الْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە رەزای خــوای لــیّ بــیّ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا صــلی اللە علیــە وســلم نــەهی کــردووە لــە کــڕین و فرۆشتنی دەستکەوتی جەنگی لەپێش دابەشکردنی.

## جوتبوون لەگەڵ ئافرەتی سکپڕی دەستکەوتی جەنگی دروست نیە

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ وَطْءِ الحَبَالَى مِنَ السَّبَايَا

١٥٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ النَّبِيلُ، عَنْ وَهْبِ أَبِي خَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، أَنَّ أَبَاهَا، أَخْبَرَهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ تُوطَأَ السَّبَايَا حَتَّى يَضَعْنَ مَا فِي بُطُونِهِنَّ. وَفِي البَاب عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ وَحَدِيثُ عِرْبَاضٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، وقَالَ الأَوْزَاعِيُّ: إِذَا اشْتَرَى الرَّجُلُ الجَارِيَةَ مِنَ السَّبْيِ وَهِيَ حَامِلٌ فَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ أَنَّهُ قَالَ: لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: وَأَمَّا الحَرَائِرُ فَقَدْ مَضَتِ السُّنَّةُ فِيهِنَّ بِأَنْ أُمِرْنَ بِالعِدَّةِ كُلُّ هَذَا حَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ.

واتــە: لــە (عربــاض)ی کــوڕی ســاریەوە رەزای خــوای لــیّ بــیّ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم نــەهی کــردووە لــە ئەنجامــدانی کــاری جوتبــوون لەگــەڵ ئــافرەتی ســکپڕی دەســتکەوتی جــەنگی هــەتا ســکەکانیان دادەنێن.

**دەربارەی خواردنی هاوبەش بۆ خوا دانەران.**

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طَعَامِ الْمُشْرِكِينَ

١٥٦٥ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سِمَاكُ بْنُ حَرْبٍ، قَال: سَمِعْتُ قَبِيصَةَ بْنَ هُلْبٍ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ طَعَامِ النَّصَارَى؟ فَقَالَ: لاَ يَتَخَلَّجَنَّ فِي صَدْرِكَ طَعَامٌ ضَارَعْتَ فِيهِ النَّصْرَانِيَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. قَالَ مَحْمُودٌ: وَقَالَ عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ قَبِيصَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، قَالَ مَحْمُودٌ: وَقَالَ وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ مُرَيِّ بْنِ قَطَرِيٍّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي طَعَامِ أَهْلِ الكِتَابِ.

واتە: لە سەماكی كوڕی حەربەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە قەبیصەی كوڕی هولب بوو، لە باوكیەوە گێڕایەوە وتی: سەبارەت بە خواردنی گاورەكان پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (با هیچ شتێ لە دڵتدا دروست نەبێ لە خواپەرستەكانی گاورەكان بچێ - خواردنی تایبەت نەبوایە نەیان دەخوارد -). خواردنی گاورەكان ڕێ پێ دراوە.

**جیاكردنەوەی منداڵ لە دایكی دروست نیە**

١٧ - بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ التَّفْرِيقِ بَيْنَ السَّبْيِ

١٥٦٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ عُمَرَ الشَّيْبَانِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُيَيٌّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ وَالِدَةٍ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ

أَحِبَّتِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ، كَرِهُوا التَّفْرِيقَ بَيْنَ السَّبْيِ بَيْنَ الوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا، وَبَيْنَ الوَلَدِ وَالوَالِدِ، وَبَيْنَ الإِخْوَةِ.

واتە: لە ئەبو ئەیوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەس دایك و منداڵەكەی لەیەك جیابكاتەوە، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لە خۆشەویستەكەی جیادەكاتەوە).

## دەربارەی كوشتنی دیلەكان و وەرگرتنی فیدیە لێیان

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ الأُسَارَى وَالفِدَاءِ

١٥٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ أَبِي السَّفَرِ، وَاسْمُهُ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الهَمْدَانِيُّ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ جِبْرَائِيلَ هَبَطَ عَلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ: خَيِّرْهُمْ، يَعْنِي أَصْحَابَكَ، فِي أُسَارَى بَدْرٍ القَتْلَ أَوِ الفِدَاءَ عَلَى أَنْ يُقْتَلَ مِنْهُمْ قَابِلاً مِثْلُهُمْ، قَالُوا: الفِدَاءَ وَيُقْتَلُ مِنَّا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي بَرْزَةَ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ،، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي زَائِدَةَ. وَرَوَى أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَرَوَى ابْنُ عَوْنٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. وَأَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ اسْمُهُ عُمَرُ بْنُ سَعْدٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: جبریل دابەزی و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فـەرموو: هاوەڵانت سەرپشك بکە لەنێوان کوشتنی دیلەکانی جـەنگی بـەدر و مـاڵ و سـامان لـێ و وەرگـرتن و بـەرەڵاکردنیان، بـەڵام چـەندیان لـێ بەرەڵابکـەن سـاڵی ئاینـدە ئەوەندەیان لـێ دەکـوژرێ، وتیـان: مـاڵ و سـامان لـێ وەرگـرتن و بـەرەڵاکردنیان و کوشتنمان لەلایەن ئەوانەوە، - جا ماڵ و سامانیان لێ و وەرگرتن و حەفتا کەسیان لێ بەرەڵاکردن کردن، ئەوەبوو بۆ ساڵی ئایندە لە جەنگی ئوحوددا حەفتا کـەس لـە هاوەڵان شەهید کران **(أَوَ لَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أنفسكم)**-.

١٥٦٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَمِّهِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَى رَجُلَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَعَمُّ أَبِي قِلاَبَةَ هُوَ أَبُو الْمُهَلَّبِ وَاسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَمْرٍو، وَيُقَالُ: مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو، وَأَبُو قِلاَبَةَ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدٍ الجَرْمِيُّ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ أَنَّ لِلإِمَامِ أَنْ يَمُنَّ عَلَى مَنْ شَاءَ مِنَ الأُسَارَى، وَيَقْتُلَ مَنْ شَاءَ مِنْهُمْ، وَيَفْدِي مَنْ شَاءَ، وَاخْتَارَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ القَتْلَ عَلَى الفِدَاءِ وقَالَ الأَوْزَاعِيُّ: بَلَغَنِي أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ مَنْسُوخَةٌ قَوْلُهُ تَعَالَى: (فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً) نَسَخَتْهَا (وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ). حَدَّثَنَا بِذَلِكَ هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ. قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ: قُلْتُ لأَحْمَدَ: إِذَا أُسِرَ الأَسِيرُ يُقْتَلُ أَوْ يُفَادَى أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: إِنْ قَدَرُوا أَنْ يُفَادُوا فَلَيْسَ بِهِ بَأْسٌ، وَإِنْ قُتِلَ فَمَا أَعْلَمُ بِهِ بَأْسًا. قَالَ إِسْحَاقُ: الإِثْخَانُ أَحَبُّ إِلَيَّ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعْرُوفًا فَأَطْمَعُ بِهِ الكَثِيرَ.

واتـە: لـە عیمرانـی کـوڕی حوسـەینەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەجیاتی دوو پیاوی موسوڵمان کە دیل بوون لەلای کافران پیاوێکی کافری بەردا واتە دیل بە دیلی پێ کردن .

بە پەیڕەوکردنی فەرموودەکە زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش رایان وایە: پێشەوا بۆی هەیە چاکە بکات لەگەڵ دیلێکدا کە خۆی بیەوێ ئازادی بکات، وە هەر دیلێ کە خۆی بیەوێ بیکوژێت، هەر دیلێکیش خۆی بیەوێ سەرانەی لێ بسەینێ. هەندێ لە زانایان کوشتنیان هەڵبژاردووە. پێشەوا ئەوزاعی دەفەرمووێ: پێم گەیشتووە کە ئایەتی: (فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً) سورة محمد: ٤. واتە: دواتر یا بە منەت و چاکە (بەرەڵایان بکەن)، یا بە فیدیەو و برێتی. ئەم ئایەتە نەسخی کردۆتەوە: (وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ). سورة البقرة: ١٩١. واتە: بیانکوژن لەهەر شوێنێ دەستان کەوتن و زاڵ بوون بەسەریاندا.

## دەربارەی قەدەغەکردنی کوشتنی ژن و منداڵ لەجەنگدا

١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ

١٥٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَلِكَ، وَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ. وَفِي البَاب عَنْ بُرَيْدَةَ، وَرَبَاحٍ، وَيُقَالُ: رَبَاحُ بْنُ الرَّبِيعِ، وَالأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ كَرِهُوا قَتْلَ النِّسَاءِ وَالوِلْدَانِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي البَيَاتِ وَقَتْلِ النِّسَاءِ فِيهِمْ وَالوِلْدَانِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ وَرَخَّصَا فِي البَيَاتِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە یەکێ لەغەزاکانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لاشەی ئافرەتێك بە کوژراوی دۆزرایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئینکاری ئەو کارەی کردو زۆری پێ ناخۆش بوو، جا نەهی کرد لە کوشتنی ئافرەت و منداڵ.

١٥٧٠ - (حسن) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي الصَّعْبُ بْنُ جَثَّامَةَ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ خَيْلَنَا أَوْطَأَتْ مِنْ نِسَاءِ الْمُشْرِكِينَ وَأَوْلاَدِهِمْ، قَالَ: هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: صەعبی کوڕی (جثامة) پێی ڕاگەیاندم فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوپای ئیسلام بەشەو لەناکاو دەدات بەسەر ماڵی هاوبەش بۆ خوا دانەراندا ئافرەتان و ژن و منداڵانیان دەکەونە ژێر پێی ئەسپەکانمان و پان دەبنەوە و دەکوژرێن ئەوە حوکمی چۆنە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەو حاڵەتەدا ئەوانیش حوکمی باب و باپیرانی خۆیانیان هەیە).

٢٠ - بَابٌ

١٥٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْثٍ، فَقَالَ: إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا لِرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أَرَدْنَا الخُرُوجَ: إِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا بِالنَّارِ وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللَّهُ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ،

وَحَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ: حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ وَقَدْ ذَكَرَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ بَيْنَ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ وَبَيْنَ أَبِي هُرَيْرَةَ رَجُلاً فِي هَذَا الحَدِيثِ وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِثْلَ رِوَايَةِ اللَّيْثِ، وَحَدِيثُ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ أَشْبَهُ وَأَصَحُّ

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كۆمەڵێكی نارد فەرمووی: (ئەگەر فلاّنە كەس و فلاّنە كەستان دەستكەوت بە ئاگر بیانسوتێنن)، كاتیٚ كە ویستمان دەرچین، فەرمووی: (فەرمانم پیٚ كردن فلاّنە كەس و فلاّنە كەستان دەستكەوت بە ئاگر بیانسوتێنن، بەڕاستی هیچ كەسێك بۆی نیە سزاو ئازاری هیچ رۆح لەبەرێك بدات بە ئاگر جگە (الله)، ئەگەر دەستانكەوتن بیانكوژن).

## دەربارەی گزی و ناپاكی لە دەستكەوتی جەنگی

### ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغُلُولِ

١٥٧٢ - (صحیح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ مَاتَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاَثٍ: الكِبْرِ، وَالغُلُولِ، وَالدَّيْنِ دَخَلَ الجَنَّةَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ.

واتە: لە (ثَوبان)ەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسیٚ بمریٚ و بەری بیٚ لەم سیانە دەچێتە بەهەشتەوە: خۆ بە زلزانین، گزی و ناپاكی لە دەستكەوتی جەنگی، قەرزاری).

١٥٧٣ - (شاذ بهذا اللفظة) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاَثٍ: الكَنْزِ، وَالغُلُولِ، وَالدَّيْنِ دَخَلَ الجَنَّةَ هَكَذَا قَالَ سَعِيدٌ: الكَنْزُ، وَقَالَ أَبُو عَوَانَةَ فِي حَدِيثِهِ: الكِبْرُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ مَعْدَانَ وَرِوَايَةُ سَعِيدٍ أَصَحُّ.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕۆح لە جەستەی دەرچێ بەری بێ لەم سیانە دەچێتە بەهەشتەوە: خۆ بە زلزانین، گزی و ناپاکی لە دەستکەوتی جەنگی، قەرزاری).

١٥٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللهِ، إِنَّ سِمَاكٌ أَبُو زُمَيْلٍ الحَنَفِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ فُلاَنًا قَدْ اسْتُشْهِدَ، قَالَ: كَلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ بِعَبَاءَةٍ قَدْ غَلَّهَا، قَالَ: قُمْ يَا عُمَرُ فَنَادِ إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ ثَلاَثًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فلانە کەس شەهید بوو، فەرمووی: (نەخێر، بەڕاستی بینیم لە ئاگردا بەهۆی عەبایەکەوە کە لایدا بوو لە دەستکەوتی جەنگی بۆ خۆی). فەرموی: (ئەی عومەر هەستە جاڕ بدەو بڵێ: بەڕاستی جگە لە باوەڕداران کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە) سێ جار.

## سەبارەت بە دەرچوونی ئافرەتان بۆ غەزا

### ٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الحَرْبِ

١٥٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ الصَّوَّافُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْزُو بِأُمِّ سُلَيْمٍ وَنِسْوَةٍ مَعَهَا مِنَ الأَنْصَارِ يَسْقِينَ الْمَاءَ وَيُدَاوِينَ الجَرْحَى. وَفِي البَاب عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئومو سولەیم و چەند ژنێکی ئەنصاری لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ غەزا، کاریان ئەوە بوو ئاویان دەگێڕا و بریندارەکانیان تەداوی دەکرد.

## دەربارەی وەرگرتنی دیاری هاوبەش بۆ خوا دانەران

### ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَبُولِ هَدَايَا الْمُشْرِكِينَ

١٥٧٦ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ كِسْرَى أَهْدَى لَهُ، فَقَبِلَ، وَأَنَّ الْمُلُوكَ أَهْدَوْا إِلَيْهِ، فَقَبِلَ مِنْهُمْ. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَثُوَيْرُ بْنُ أَبِي فَاخِتَةَ اسْمُهُ سَعِيدُ بْنُ عِلاَقَةَ، وَثُوَيْرٌ يُكْنَى أَبَا جَهْمٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلایەن کیسراوە دیاریەکی بۆ هات، وەریگرت، بێگومان پاشاکان دیاریان بۆ دەنارد، ئەویش لێی قبوڵ دەکردن.

## وەرگرتنی دیاری هاوبەش بۆ خوا دانەران دروست نیە

### ٢٤ - بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ هَدَايَا الْمُشْرِكِينَ

١٥٧٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ عِمْرَانَ الْقَطَّانِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ، أَنَّهُ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَدِيَّةً لَهُ أَوْ نَاقَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَسْلَمْتَ، قَالَ: لاَ، قَالَ: فَإِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَمَعْنَى قَوْلِهِ: إِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ، يَعْنِي: هَدَايَاهُمْ وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقْبَلُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ هَدَايَاهُمْ وَذُكِرَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ الْكَرَاهِيَةُ، وَاحْتَمَلَ أَنْ يَكُونَ هَذَا بَعْدَ مَا كَانَ يَقْبَلُ مِنْهُمْ، ثُمَّ نَهَى عَنْ هَدَايَاهُمْ.

واتە: لە (عیاض)ی كوڕی حیمارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پیاوێ وشترێكی مێی كردە دیاری بۆ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (تۆ موسوڵمان بویت؟) وتم: نەخێر، فەرمووی: (من ڕێگریم لێكراوە كە دیاری و باربۆ و بەخشینی هاوبەش بۆ خوا دانەران قبوڵ بكەم).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەجدەی شوكر

### ٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سَجْدَةِ الشُّكْرِ

١٥٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكَّارُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَاهُ أَمْرٌ، فَسُرَّ بِهِ، فَخَرَّ لِلَّهِ سَاجِدًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ بَكَّارِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ رَأَوْا سَجْدَةَ الشُّكْرِ، وَبَكَّارُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ مُقَارِبُ الْحَدِيثِ.

واتە: لە (أَبِي بَكْرَةَ)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله

علیه وسلم شتێكی دەهاتە پێش پێی شاد و دڵخۆش بوایە سەجدەی شوكری برد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەمانی ئافرەت و بەندە

## ٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَمَانِ العَبْدِ وَالمَرْأَةِ

١٥٧٩ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَكْثَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ لَتَأْخُذُ لِلْقَوْمِ، يَعْنِي: تُجِيرُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ. وَفِي البَاب عَنْ أُمِّ هَانِئٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا، فَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَكَثِيرُ بْنُ زَيْدٍ قَدْ سَمِعَ مِنَ الوَلِيدِ بْنِ رَبَاحٍ، وَالوَلِيدُ بْنُ رَبَاحٍ سَمِعَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَهُوَ مُقَارِبُ الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئافرەتی موسوڵمان پەنای كافری دا كە رێگری بكات لەوەی موسوڵمانان نەیكوژن ئەوە كارەكەی دروستەو نابێ بیكوژن).

١٥٧٩ (م) - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ أَنَّهَا قَالَتْ: أَجَرْتُ رَجُلَيْنِ مِنْ أَحْمَائِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَدْ أَمَّنَّا مَنْ أَمَّنْتِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، أَجَازُوا أَمَانَ الْمَرْأَةِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقُ، أَجَازَ أَمَانَ الْمَرْأَةِ، وَالعَبْدِ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ وَأَبُو مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ وَيُقَالُ لَهُ أَيْضًا: مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ أَيْضًا، وَاسْمُهُ يَزِيدُ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ أَنَّهُ أَجَازَ أَمَانَ العَبْدِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ. وَمَعْنَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ مَنْ أَعْطَى الأَمَانَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَهُوَ جَائِزٌ عَلَى كُلِّهِمْ.

واتە: لە (أم هانیء)ی کچی (أبِی طَالِب)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا پەنای دوو پیاوی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەری خزمی مێردەکەمم دا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێمەش پەنای ئەو کەسە دەدەین کە تۆ پەنات داوە، ئەمان دەدەینە کەسێ کە تۆ ئەمانت داوەتێ).

لە پێشەوا عەلی و (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەمانی موسوڵمان هەر یەکە، خوارینەکەیان مافی ئەماندانی هەیە بە هەر کافرێ کە بیەوێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی غەدر و ناپاکی

### ٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغَدْرِ

١٥٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الفَيْضِ، قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَ بْنَ عَامِرٍ، يَقُولُ: كَانَ بَيْنَ مُعَاوِيَةَ وَبَيْنَ أَهْلِ الرُّومِ عَهْدٌ، وَكَانَ يَسِيرُ فِي بِلاَدِهِمْ، حَتَّى إِذَا انْقَضَى العَهْدُ أَغَارَ عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رَجُلٌ عَلَى دَابَّةٍ أَوْ عَلَى فَرَسٍ، وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَفَاءٌ لاَ غَدْرٌ، وَإِذَا هُوَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ، فَسَأَلَهُ مُعَاوِيَةُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ فَلاَ يَحُلَّنَّ عَهْدًا، وَلاَ يَشُدَّنَّهُ حَتَّى يَمْضِيَ أَمَدُهُ أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ، قَالَ: فَرَجَعَ مُعَاوِيَةُ بِالنَّاسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سولەیمی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەنێوان موعاویەو ڕۆمەکاندا پەیمان هەبوو، موعاویە رەزای خوای لێ بێ بەخۆی و لەشکرێکەوە بەرەو وڵاتی ڕۆمەکان کەوتەرێ، بۆئەوە نزیک بێتەوە لێیان هەتا

ئەگەر ماوەی پەیمانەکە تەواو بوو غەزایان بکات، پیاوێ بە سواری وڵاخێ یان ئەسپێکەوە هات هاواری دەکردو دەیوت: (الله أکبر)، (الله أکبر)، غەدر مەکەن وەفاتان هەبێ بەرامبەر بەو پەیمانەی کە داوتانە واجبە لەسەرتان ئەو پەیمانە بیپارێزن، سەیریان کرد دەبینن عەمری کوڕی عەبەسەیە، موعاویە رەزای خوای لێ بێ لەوبارەوە پرسیاری لێ کرد، عەمر فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێك لەنێوان ئەو و کۆمەڵێکدا پەیمان هەبوو، ئەوە با بەیەك لایەنەو لەلای خۆیەوە هەڵینەوەشێنێتەوە هەتا کاتەکەی تەواو دەبێ، یان پەیمانەکەیان پێ بداتەوە بۆ ئەوەی هەردوو لایان یەکسان بن لەهەڵوەشاندنەوەی و ئاگادارین). وتی: ئیتر موعاویە بەخۆی و لەشکرەکەیەوە گەڕایەوە.

### لە رۆژی قیامەتدا بۆ هەموو غەدرکارێ ئاڵایە هەیە

### ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءً يَوْمَ القِيَامَةِ

١٥٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنِي صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ الغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ، وَأَنَسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا، عَنْ حَدِيثِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ، فَقَالَ: لاَ أَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ مَرْفُوعًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (غەدرکار لە رۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی بۆ دادەچەقێنرێ، دەڵێن: بزانن ئەمە غەدری فلانی کوڕی فولانە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دابەزین لەسەر بڕیار

## ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النُّزُولِ عَلَى الحُكْمِ

١٥٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّهُ قَالَ: رُمِيَ يَوْمَ الأَحْزَابِ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَطَعُوا أَكْحَلَهُ أَوْ أَبْجَلَهُ، فَحَسَمَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالنَّارِ، فَانْتَفَخَتْ يَدُهُ، فَتَرَكَهُ فَنَزَفَهُ الدَّمُ، فَحَسَمَهُ أُخْرَى، فَانْتَفَخَتْ يَدُهُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ، قَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تُخْرِجْ نَفْسِي حَتَّى تُقِرَّ عَيْنِي مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ، فَاسْتَمْسَكَ عِرْقُهُ، فَمَا قَطَرَ قَطْرَةً، حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَحَكَمَ أَنْ يُقْتَلَ رِجَالُهُمْ وَتُسْتَحْيَا نِسَاؤُهُمْ، يَسْتَعِينُ بِهِنَّ الْمُسْلِمُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَبْتَ حُكْمَ اللهِ فِيهِمْ، وَكَانُوا أَرْبَعَ مِائَةٍ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَتْلِهِمْ انْفَتَقَ عِرْقُهُ فَمَاتَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَطِيَّةَ القُرَظِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژی غەزای خەندەق کاتێ کە ئەحزابەکان هەر هەموویان کۆبوونەوە بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان سەعدی کوڕی (معاذ) ڕەزای خوای لێ بێ بە تیرێ باڵی پێکرا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم برینەکەی داخ کرد تووشی خوێن بەربوون بوو، جارێکی تر داخی کردەوە خوێنەکەی نەدەوەستایەوە، کاتێ سەعد ئەوەی دی فەرمووی: خودایە ڕۆحم نەکێشی هەتا چاوەکانم ڕۆشن دەبنەوە بە لەناوچوونی بەنی (قریظة)، ئیتر خوێنەکەی وەستایەوە و یەك دڵۆپی لێ نەڕۆشت، هەتا لەسەر حوکم و بڕیاری سەعد دابەزین و لە قەڵاکانیان و هاتنەخوارەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوای سەعددا، سەعد بڕیاری دا پیاوە جەنگاوەرەکانیان بکوژن و ژنەکانیشیان دابەش بکەن بەسەر موسوڵماناندا بۆ ئەوەی وەك خزمەتکار بەکاریان

بهێنن، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی سەعد حوکم و بڕیاری خودات پێکا دەربارەیان) واتە خوای گەورەش بە هەمان شێوە بڕیاری داوە. ئەوکاتە ژمارەی پیاوە جەنگاوەرەکانیان چوار سەد کەس بوون، کاتێ کە سەرجەمیان کوشتن و لێ بوونەوە، برینەکەی سەعد کرایەوە و خوێنی بەربوو مرد.

١٥٨٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اقْتُلُوا شُيُوخَ الْمُشْرِكِينَ، وَاسْتَحْيُوا شَرْخَهُمْ وَالشَّرْخُ: الغِلْمَانُ الَّذِينَ لَمْ يُنْبِتُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَرَوَاهُ الحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ قَتَادَةَ نَحْوَهُ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاوە لێهاتووەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران بکوژن و ئەو منداڵانەی کە مووییان لێ نەهاتووە بهێڵنەوە و مەیانکوژن).

١٥٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَطِيَّةَ القُرَظِيِّ، قَالَ: عُرِضْنَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ قُرَيْظَةَ فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُهُ، فَكُنْتُ مِمَّنْ لَمْ يُنْبِتْ فَخُلِّيَ سَبِيلِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُمْ يَرَوْنَ الإِنْبَاتَ بُلُوغًا، إِنْ لَمْ يُعْرَفْ احْتِلاَمُهُ وَلاَ سِنُّهُ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: (عَطِيَّةَ القُرَظِيِّ) دەفەرمووێ: ڕۆژی (قُرَيْظَة) نیشانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دراین، کێ شەرمگەی مووی پێوە بوایە دەیانکوشت چونکە ئەوە نیشانەی باڵغ بوونی بوو، ئەوەشی شەرمگەی مووی پێوە نەبوایە نەیاندەکوشت، منیش یەکێ بووم لەوانەی شەرمگەم مووی پێوە نەبوو بۆیە بەرەڵایان کردم.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڵێن و پەیمان

### ٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحِلْفِ

١٥٨٥ - (حسن) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: أَوْفُوا بِحِلْفِ الجَاهِلِيَّةِ فَإِنَّهُ لاَ يَزِيدُهُ، يَعْنِي الإِسْلاَمَ، إِلاَّ شِدَّةً، وَلاَ تُحْدِثُوا حِلْفًا فِي الإِسْلاَمِ. وَفِي البَاب عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَجُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَقَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە وتارەكەیدا فەرمووی: (وەفاتان هەبێ بەرامبەر بە بەڵێن و پەیمانی شەرعی سەردەمی نەفامی و جێبەجێی بكەن، چونكە ئیسلام هیچی بۆ زیاد ناكات بەڵكو پتەوتری دەكات، بەڵێن و پەیمانی تازە دامەهێنن لە ئیسلامدا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرانە سەندن لە ئاگرپەرستان

### ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الجِزْيَةِ مِنَ الْمَجُوسِ

١٥٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ بَجَالَةَ بْنِ عَبْدَةَ، قَالَ: كُنْتُ كَاتِبًا لِجَزْءِ بْنِ مُعَاوِيَةَ عَلَى مَنَاذِرَ، فَجَاءَنَا كِتَابُ عُمَرَ: انْظُرْ مَجُوسَ مَنْ قِبَلَكَ فَخُذْ مِنْهُمُ الجِزْيَةَ، فَإِنَّ

عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ أَخْبَرَنِي، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ الجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە بەجالەی کوڕی (عَبْدَةَ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە شوێنێ کە ناوی (مَنَاذِر) بوو نووسەری جەزئی کوڕی موعاویە بووم، کاتێ کە نامەکەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ گەیشت ساڵێ پێش مردنی بەم شێوەیە نووسی بووی: سەرانە وەرگرن لە ئاگرپەرستان، چونکە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف ڕەزای خوای لێ بێ پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرانەی لە ئاگرپەرستانی وڵاتی هەجەر وەردەگرت.

١٥٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ بَجَالَةَ، أَنَّ عُمَرَ كَانَ لاَ يَأْخُذُ الجِزْيَةَ مِنَ الْمَجُوسِ، حَتَّى أَخْبَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ الجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ. وَفِي الحَدِيثِ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەجالەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ سەرانە وەنەدەگرت لە ئاگرپەرستان، هەتا (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف ڕەزای خوای لێ بێ پێی ڕاگەیاند، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەرانەی وەردەگرت لە ئاگرپەرستانی وڵاتی هەجەر.

١٥٨٨ - حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ أَبِي كَبْشَةَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ البَحْرَيْنِ، وَأَخَذَهَا عُمَرُ مِنْ فَارِسَ، وَأَخَذَهَا عُثْمَانُ مِنَ الفُرْسِ.

وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا، فَقَالَ: هُوَ مَالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ(١).

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرانەی وەردەگرت لە ئاگرپەرستانی وڵاتی بەحرەین، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ سەرانەی وەردەگرت لە فارسەکان، هەروەها پێشەوا (عثمان)یش ڕەزای خوای لێ بێ سەرانەی وەردەگرت لە فارسەکان.

## چ ماڵ و سامانێکی ئەهلی (ذمة) حەڵاڵە بۆ موسوڵمانان

## ٣٢ - بَابُ مَا يَحِلُّ مِنْ أَمْوَالِ أَهْلِ الذِّمَّةِ

١٥٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَمُرُّ بِقَوْمٍ فَلاَ هُمْ يُضَيِّفُونَا، وَلاَ هُمْ يُؤَدُّونَ، مَا لَنَا عَلَيْهِمْ مِنَ الحَقِّ وَلاَ نَحْنُ نَأْخُذُ مِنْهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ أَبَوْا إِلاَّ أَنْ تَأْخُذُوا كَرْهًا فَخُذُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَاهُ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ أَيْضًا وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: أَنَّهُمْ كَانُوا يَخْرُجُونَ فِي الغَزْوِ فَيَمُرُّونَ بِقَوْمٍ وَلاَ يَجِدُونَ مِنَ الطَّعَامِ مَا يَشْتَرُونَ بِالثَّمَنِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ أَبَوْا أَنْ يَبِيعُوا إِلاَّ أَنْ تَأْخُذُوا كَرْهًا فَخُذُوا، هَكَذَا رُوِيَ فِي بَعْضِ الحَدِيثِ مُفَسَّرًا، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ بِنَحْوِ هَذَا.

---

(١) قال بشار: هذا الحديث ليس من أحاديث الترمذي لأمور: ١ - أن المزي لم يذكره في "تحفة الأشراف"، ولا استدركه عليه الحافظان: العراقي، وابن حجر. ٢ - أن المزي لما ترجم للحسين بن أبي كبشة في "تهذيب الكمال"، وذكر روايته عن عبد الرحمن بن مهدي، لم يُرقم عليه برقم الترمذي. ٣- أن الهيثمي ذكره في "مجمع الزوائد" ٥/ ١٣. وانظر "المسند الجامع" (٦/ ٢٦) حديث (٣٩٧٦). انتهى. وهذا الحديث لايوجد في النسخة الخطية للكروخي.

واتــە: لــە عوقبــەی کــوڕی عــامیرەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جاری وا دەبـێ تـۆ دەمان نێری بە نوێنـەری یـان بـۆ کـارێ یـا بـۆ غەزایـە، بـەلای قـەومێکی ئـەهلی (ذمة)دا تێدەپەڕین میوانداریمان ناکەن و هیچمان نادەنێ و هیچیان لێ وەرنـاگرین، ئایا ئێمە چ هەق و مافێکمان لەسەریانە؟ پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرمووی: (ئەگەر بوونە میوان لەلای قەومێ ئەوەی عادەتە بۆ میوان دەکرێ بۆیان کردن ئەوە لێیان قبوولْ بکەن، ئەگەر نەیانکرد ئەوەی کە مافی میوانە بـەزۆر لێیـان بسێنن).

لە یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیبەوە دەگێڕنەوە، مانـای فەرموودەکـە بـەم شـێوەیە: جاری وا دەبـوو ئـەوان دەردەچـوون بـۆ غـەزایـە، دەیانـدا بـەلای قـەومێکی ئـەهلی (ذمة)دا خواردنیان دەست نەدەکەوت بە پـارە بیکـڕن. پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر پێیان نەفرۆشتن بەزۆر بەشی خۆتانیان لێ بسێنن).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆچکردن

٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الهِجْرَةِ

١٥٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حُبْشِيٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ مَنْصُورِ بْنِ الْمُعْتَمِرِ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەرۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا فەرمووی: (لەدوای رزگارکردنی شاری مەککەوە ئیتر کۆچکردنی واجب لە مەککەوە بۆ مەدینە نیە، بەلاّم کۆچکردن بۆ جیهاد و تێکۆشان و بەنیەتی جیهادکردن هەر دەمێنێ و بەردەوامە، هەرکاتێ فەرمانتان پێ کرا لەلایەن فەرمانڕەوای موسولّمانانەوە کە دەرچن بۆ جەنگ و غەزا ئێوەش دەرچن).

## دەربارەی پەیماندان بە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

١٥٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ) قَالَ جَابِرٌ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ، وَلَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ. وَفِي البَاب عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعُبَادَةَ، وَجَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عِيسَى بْنِ يُونُسَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: قَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ وَلَمْ يُذْكَرْ فِيهِ أَبُو سَلَمَةَ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ). سورة الفتح: ١٨. واتە: بەڕاستی خوای گەورە رازی بوو لە بڕواداران کاتێ کە لەژێر درەختەکەی سەر ئاوی حودەیبیەدا دەستیان خستە ناو دەستت و بەیعەتیان پێ کردی. جابیر فەرمووی: پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە رانەکەین و پشت نەکەینە جەنگ، پەیمانمان پێ نەدا لەسەر مردن.

١٥٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع: لە ڕۆژی حودەیبیەدا لەسەرچی پەیمانتان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: لەسەر مردن.

١٥٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فَيَقُولُ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى كِلاَ الْحَدِيثَيْنِ صَحِيحٌ، قَدْ بَايَعَهُ قَوْمٌ مِنْ أَصْحَابِهِ عَلَى الْمَوْتِ، وَإِنَّمَا قَالُوا: لاَ نَزَالُ بَيْنَ يَدَيْكَ حَتَّى نُقْتَلَ، وَبَايَعَهُ آخَرُونَ، فَقَالُوا: لاَ نَفِرُّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە لەقسەی دەرنەچین و گوێڕایەڵی بکەین، پێی دەفەرمووین: کە بڵێین: ئەوەندەی لەتوانامانـدا هەبێت. مانای هەردوو فەرموودەکە راست و دروستە، بێگومان هەندێ لە هاوەڵان پەیمانیان

دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مردن، بەڕاستی وتیان: بەردەوام لە خزمەتتداین هەتا مردن، هەندێکی تریان پەیمانیان پێ دا وتیان: ڕاناکەین و پشت ناکەینە جەنگ.

١٥٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَمْ نُبَايِعْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمَوْتِ، إِنَّمَا بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرمووی: پەیمانمان نەدا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مردن، بەڵكو پەیمانمان پێ دا لەسەر ئەوەی كە ڕانەكەین و پشت نەكەینە جەنگ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیمان شكاندن

## ٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نَكْثِ الْبَيْعَةِ

١٥٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا فَإِنْ أَعْطَاهُ وَفَى لَهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ بِلاَ اخْتِلاَفٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سێ كەس لە ڕۆژی قیامەتدا خوا نایان دوێنێ، وە لە تاوان پاكیان ناكاتەوە، وە سزای سەخت و توندیان بۆ هەیە: كەسێك پەیمان بدات بە پێشەوایە ئەگەر پێی ببەخشێ وەفای هەبێ و پابەند بێ بە بەیعەتەكەیەوە، خۆ ئەگەر پێی نەبەخشێ وەفای نەبێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیمانی بەندە

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعَةِ العَبْدِ

١٥٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الهِجْرَةِ، وَلاَ يَشْعُرُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ عَبْدٌ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِعْنِيهِ، فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، وَلَمْ يُبَايِعْ أَحَدًا بَعْدُ حَتَّى يَسْأَلَهُ: أَعَبْدٌ هُوَ؟ وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الزُّبَيْرِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بەندەیە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، ئەویش نەیزانی بەندەیە پەیمانی لێ وەرگرت بەو مەرجەی کۆچ بکات بۆ مەدینە، جا گەورەکەی هات داوای کردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (پێم بفرۆشە)، جا بە دوو بەندەی رەش لێی کری، لەپاشدا ئیتر پەیمانی لەکەس وەرنەدەگرت هەتا پرسیاری لێ نەکردایە کە بەندەیە یان نا.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیمانی ئافرەتان

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعَةِ النِّسَاءِ

١٥٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ أُمَيْمَةَ بِنْتَ رُقَيْقَةَ، تَقُولُ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ، قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنَّا بِأَنْفُسِنَا،

قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، بَايِعْنَا، قَالَ سُفْيَانُ: تَعْنِي صَافِحْنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ كَقَوْلِي لِامْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ. وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ نَحْوَهُ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: لاَ أَعْرِفُ لأُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ، وَأُمَيْمَةُ امْرَأَةٌ أُخْرَى لَهَا حَدِيثٌ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بۆ خۆی گوێی لە ئومەیمەی کچی ڕوقەیقەوە بووە دەیفەرموو: لەگەڵ چەند ئافرەتێکدا پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێی فەرمووین: بڵێین: ئەوەندەی کە دەتوانین و لە توانامان‌دا هەیە)، وتم: خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم لە خۆمان بە بەزەیی ترن بۆمان، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەوا پەیمانمان دا، فەرمووی: (بەڕاستی وتەی من بۆ سەد ئافرەت، وەك ئەو وتەیەم وایە بۆ ئافرەتێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ژمارەی هاوەڵانی جەنگی بەدر

### ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عِدَّةِ أَصْحَابِ أَهْلِ بَدْرٍ

١٥٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ أَصْحَابَ بَدْرٍ يَوْمَ بَدْرٍ كَعِدَّةِ أَصْحَابِ طَالُوتَ ثَلاَثُ مِائَةٍ وَثَلاَثَةَ عَشَرَ رَجُلاً. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُهُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ.

واتە: لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە باسی

ژمارەی هاوەڵانی جەنگی بەدرمان دەكرد، كە ژمارەیان بە قەد ژمارەی هاوەڵانی (طالوت) دەبوو، كە ژمارەیان سێ سەد و سیانزە پیاو بوون).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێنج یەك

٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْخُمُسِ

١٥٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ الْمُهَلَّبِيُّ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِوَفْدِ عَبْدِ الْقَيْسِ: آمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ. وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نوێنەری عەبدی قەیسی فەرموو: (فەرمانتان پێ دەكەم بە دەركردنی پێنج یەك لە دەستكەوتی جەنگی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خراپی راورووت و تالآنی

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النُّهْبَةِ

١٦٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَتَقَدَّمَ سَرَعَانُ النَّاسِ، فَتَعَجَّلُوا مِنَ الغَنَائِمِ، فَاطَّبَخُوا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أُخْرَى النَّاسِ، فَمَرَّ بِالقُدُورِ فَأَمَرَ بِهَا، فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ بَيْنَهُمْ، فَعَدَلَ بَعِيرًا بِعَشْرِ شِيَاهٍ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبَايَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِيهِ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا

وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ. وَهَذَا أَصَحُّ. وَفِي البَاب عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ الحَكَمِ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي رَيْحَانَةَ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أَيُّوبَ. وَعَبَايَةُ بْنُ رِفَاعَةَ سَمِعَ مِنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ.

واتە: لە رافیعی كوڕی خەدیجەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئێمە لە سەفەرێكدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، خەڵكەكە ئەوانەی كە لەپێشەوە بوون و بە پەلە بوون بە دەستكەوتەوە گەڕانەوە دەستكەوتەكە وشتر و مەڕیشی تێدابوو، مەنجەڵیان خستە سەر ئاگر و خۆیان ئامادە كرد بۆ گۆشت لێنان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای خەڵكەكەوە بوو، دای بەلای مەنجەڵەكاندا فەرمانی دا مەنجەڵەكانیان قڵپ كردەوەو رێگری لێ كردن كە بەكاری بهێنن، چونكە غەنیمەتەكە هێشتا دابەش نەكرابوو، جا دەستكەوتەكەی دابەشكرد بەسەریاندا، وشترێكی لەبەرامبەر دە مەڕدا دادەنا.

١٦٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ انْتَهَبَ فَلَيْسَ مِنَّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ راوڕوت و تاڵانی بكات لەسەر رێباز و سوننەتی ئێمە نیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سلاوکردن لە گاور و جولەکە

٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عَلَى أَهْلِ الكِتَابِ

١٦٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَبْدَءُوا اليَهُودَ، وَالنَّصَارَى بِالسَّلاَمِ، وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي الطَّرِيقِ فَاضْطَرُّوهُمْ إِلَى أَضْيَقِهِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي بَصْرَةَ الغِفَارِيِّ صَاحِبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە لەپێشەوە سلاو لە گاور و جولەکە مەکەن، ئەگەر لە رێگەدا گەیشتن بە یەکێ لەوان رێگەکە تەنگەبەر بوو ناچاری بکەن با ئەو بکەوێتە تەنگەبەریەکەوە و لەوێوە گوزەر بکات).

١٦٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اليَهُودَ إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدُهُمْ فَإِنَّمَا يَقُولُ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَقُلْ: عَلَيْكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی کاتێ جولەکە سلاو لەئێوەی موسوڵمان دەکەن دەڵێن: (خوا بتانکوژێت) ئێوەش بڵێن: (خوا ئێوەش بکوژێت).

## دروست نیە نیشتەجێ بوون لەناو هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەراندا

## ٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْمُقَامِ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ

١٦٠٤ - (صحيح دون: أَمَرَ لَهُمْ بِنِصْفِ العَقْلِ) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً إِلَى خَثْعَمٍ فَاعْتَصَمَ نَاسٌ بِالسُّجُودِ، فَأَسْرَعَ فِيهِمُ القَتْلَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ لَهُمْ بِنِصْفِ العَقْلِ وَقَالَ: أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَلِمَ؟ قَالَ: لاَ تَرَاءَى نَارَاهُمَا.

واتە: لە جەریری کوڕی (عَبْدِ اللهِ)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەشکرێکی نارد بۆسەر هۆزی (خثعم)، چەند کەسێ لەوان پەنایان برد بۆ سەجدەبردن و سەجدەیان دەبرد، بۆ ئەوەی نەیانکوژن، بەڵام لە پەلە پەلیدا کوژران، هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەویش فەرمانی پێ کردن بەوەی کە نیوەی خوێنەکەیان بدەن، وە فەرمووی: (من بەریم لەهەر موسوڵمانێ کە لەناو هاوبەش بڕیاردەراندا دادەنیشێ و نیشتەجێ دەبێت). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆچی؟ فەرمووی: (پێویستە لەسەر موسوڵمان لەگەڵ کافردا نەبێت، بەڵکو دەبێ ماڵی دور بێت لە ماڵیان بەشێوەیە ئەگەر هەر یەکەیان ئاگری کردەوە ئەوی تریان نەیبینێ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ دوری نێوان موسوڵمانان و کافران).

١٦٠٥ - حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ جَرِيرٍ وَهَذَا أَصَحُّ. وَفِي البَاب عَنْ سَمُرَةَ. وَأَكْثَرُ أَصْحَابِ إِسْمَاعِيلَ قَالُوا: عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ جَرِيرٍ. وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: الصَّحِيحُ حَدِيثُ قَيْسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ. وَرَوَى سَمُرَةُ بْنُ جُنْدَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُسَاكِنُوا الْمُشْرِكِينَ، وَلاَ تُجَامِعُوهُمْ، فَمَنْ سَاكَنَهُمْ أَوْ جَامَعَهُمْ فَهُوَ مِثْلُهُمْ.

واتە: لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەراندا نیشتەجێ مەبن و هاوسێیەتیان مەكەن و تێكەڵاویان مەكەن، ئەوەی هاوسێیەتیان بكات و تێكەڵاویان بكات وەك ئەوان وایە).

## دەربارەی دەركردنی گاور و جولەكە لە جەزیرەی عەرەب

٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِخْرَاجِ اليَهُودِ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ العَرَبِ

١٦٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الحُبَابِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَئِنْ عِشْتُ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَأُخْرِجَنَّ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ العَرَبِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر مام بە ویستی خوای گەورە گاور و جولەكە لە جەزیرەی عەرەبی دەردەكەم).

١٦٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالاَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ

يَقُولُ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَأُخْرِجَنَّ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ العَرَبِ، فَلاَ أَتْرُكُ فِيهَا إِلاَّ مُسْلِمًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (گاور و جولەکە لە جەزیرەی عەرەبی دەردەکەم، جگە لە موسوڵمان کەسی تێدا ناهێڵم).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرِكَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

١٦٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَتْ: مَنْ يَرِثُكَ؟ قَالَ: أَهْلِي، وَوَلَدِي، قَالَتْ: فَمَا لِي لاَ أَرِثُ أَبِي؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ نُورَثُ، وَلَكِنِّي أَعُولُ مَنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُولُهُ، وَأُنْفِقُ عَلَى مَنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَطَلْحَةَ، وَالزُّبَيْرِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدٍ، وَعَائِشَةَ، وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ إِنَّمَا أَسْنَدَهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، وَعَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، فَقَالَ: لاَ أَعْلَمُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، إِلاَّ حَمَّادَ بْنَ سَلَمَةَ. وَقَدْ رَوَاهُ عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ نَحْوَ رِوَايَةِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ خزمەت پێشەوا

ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: (کێ میراتبەری تۆیە؟) فەرمووی: خانەوادە و کەسوکار و منداڵەکانم، فەرمووی: ئەی بۆ من میراتبەری باوکم نیم؟ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (میراتمان لێ ناگیرێ). بەڵام ئێمە کەسێ بەخێو دەکەین کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەخێوی کردبێ، دەبەخشین بە کەسێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشتر پێی دەبەخشی.

١٦٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَلِيُّ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ فَاطِمَةَ جَاءَتْ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، تَسْأَلُ مِيرَاثَهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالاَ: سَمِعْنَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنِّي لاَ أُورَثُ، قَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أُكَلِّمُكُمَا أَبَدًا، فَمَاتَتْ وَلاَ تُكَلِّمُهُمَا. قَالَ عَلِيُّ بْنُ عِيسَى: مَعْنَى لاَ أُكَلِّمُكُمَا، تَعْنِي: فِي هَذَا الْمِيرَاثِ أَبَدًا أَنْتُمَا صَادِقَانِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ خزمەت پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ، داوای میراتی باوکی لێ کردن، فەرموویان: بۆ خۆمان گوێمان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (من میراتم لێ ناگیرێ). (فاطمة) فەرمووی: سوێند بە (الله) هەرگیز لەوبارەوە قسەتان لەگەڵ ناکەم، چونکە هەردووکتان راستگۆن، ئەوە بوو هەتا مرد قسەی لەگەڵ نەکردن.

١٦١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا بِشْرُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الحَدَثَانِ، قَالَ:

دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَدَخَلَ عَلَيْهِ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَالزُّبَيْرُ بْنُ العَوَّامِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ، وَالعَبَّاسُ يَخْتَصِمَانِ، فَقَالَ عُمَرُ لَهُمْ: أَنْشُدُكُمْ بِاللهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ عُمَرُ فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجِئْتَ أَنْتَ وَهَذَا إِلَى أَبِي بَكْرٍ تَطْلُبُ أَنْتَ مِيرَاثَكَ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ، وَيَطْلُبُ هَذَا مِيرَاثَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ صَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ: وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی (الحدثان)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، پێشەوا (عُثْمَان)ی كوڕی عەففان و زوبێری كوڕی عەوام و (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی عەوف و سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصیش هاتن بۆ خزمەتی، عەباس و عەلیش ڕەزای خوایان لێ بێ دمەقاڵەیان بوو، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: تو ئەو خوایەی كە بە فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی ڕاوەستاوە، ئایا ئاگادارن كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج بكرێت). وتیان: بەڵێ، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی كرد، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: من وەلی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم، ئەوە بوو تۆ و ئەمە هاتن بۆلای پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ، تۆ ئەی عەباس داوای میراتی برازاكەت دەكرد، عەلیش داوای میراتی (فاطمة)ی هاوسەری دەكرد

لە میراتی باوکی، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت). خوای گەورە دەزانێت کە ئەبو بەکر ڕاستگۆو چاکەکار و هەقخواز و شوێنکەوتەی هەق و ڕاستی بوو.

## دەربارەی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: شاری مەککە جارێکی تر غەزا ناکرێتەوە

٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ مَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: إِنَّ هَذِهِ لاَ تُغْزَى بَعْدَ اليَوْمِ

١٦١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَكَرِيَّا بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ الْبَرْصَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ يَقُولُ: لاَ تُغْزَى هَذِهِ بَعْدَ الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ، وَمُطِيعٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهُوَ حَدِيثُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، فَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ.

واتە: لە (حارث)ی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو لەڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا دەیفەرموو: (لە ئەمڕۆ بەدواوە ئەم شارە جارێکی تر غەزا ناکرێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت).

## دەربارەی ئەو کاتەی کە باشە بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّاعَةِ الَّتِي يُسْتَحَبُّ فِيهَا القِتَالُ

١٦١٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ إِذَا طَلَعَ الفَجْرُ أَمْسَكَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتْ قَاتَلَ، فَإِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ أَمْسَكَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ قَاتَلَ حَتَّى العَصْرِ، ثُمَّ أَمْسَكَ حَتَّى يُصَلِّيَ العَصْرَ ثُمَّ يُقَاتِلُ قَالَ: وَكَانَ يُقَالُ عِنْدَ ذَلِكَ: تَهِيجُ رِيَاحُ النَّصْرِ وَيَدْعُو الْمُؤْمِنُونَ لِجُيُوشِهِمْ فِي صَلاَتِهِمْ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ بِإِسْنَادٍ أَوْصَلَ مِنْ هَذَا، وَقَتَادَةُ لَمْ يُدْرِكِ النُّعْمَانَ بْنَ مُقَرِّنٍ، وَمَاتَ النُّعْمَانُ بْنُ مُقَرِّنٍ فِي خِلاَفَةِ عُمَرَ.

واتە: لە نوعمانی کوڕی موقەڕینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بەشداری غەزام کردووە، کاتێ کە بەیانی دەدا وازی لەجەنگ دەهێنا هەتا خۆرهەڵدەهات، کاتێ کە خۆرهەڵدەهات دەستی دەکردەوە بە جەنگ کردن هەتا کاتی نیوەڕۆ، ئەوکاتە وازی لەجەنگ دەهێنا هەتا نوێژی نیوەڕۆی دەکردوو خۆر لایدەدا ئەوکاتە دەستی دەکردەوە بە جەنگ کردن هەتا نوێژی عەسر جا نوێژی عەسری دەکرد و دەستی دەکردەوە بە جەنگ کردن، راوی وتی: هاوەڵان دەیانوت: بۆیە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو کاتانەدا جەنگی رادەگرت هەتا باوەڕداران لەکاتی نوێژەکانیاندا بپاڕێنەوە بۆ خۆیان و بۆ سوپاکەیان بێگومان ئەو کاتانەش کاتی وەرگرتنی پاڕانەوەیەو دەبێت بەهۆی سەرکەوتن.

١٦١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَالحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الجَوْنِيُّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُزَنِيِّ، عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ بَعَثَ النُّعْمَانَ بْنَ مُقَرِّنٍ إِلَى الهُرْمُزَانِ، فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ، فَقَالَ النُّعْمَانُ بْنُ مُقَرِّنٍ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ أَوَّلَ النَّهَارِ انْتَظَرَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَتَهُبَّ الرِّيَاحُ، وَيَنْزِلَ النَّصْرُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَعَلْقَمَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ هُوَ أَخُو بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُزَنِيِّ.

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێشـەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ نوعمانی کوڕی موقەڕینی ڕەزای خوای لێ بێ نـارد بـۆ لای هـورمزان، جـا راوی فەرموودەکـەی بـە درێـژی گێڕایـەوە، نوعمـانی کـوڕی موقەڕین فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بەشداری غـەزام کردووە، ئەگەر لەسەرەتای ڕۆژەوە جەنگی دەست پێ نەکردایە، ئەوا دوای دەخسـت هەتا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا، دیارە ئـەو کاتـەش کـاتی هـەڵکردنی بایـەو فێنك دەکات و دەبێت بەهۆی دابەزینی سەرکەوتن.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی شومیەتی دانە پاڵ شتێك

### ٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الطِّيَرَةِ

١٦١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ عِيسَى بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الطِّيَرَةُ مِنَ الشِّرْكِ، وَمَا مِنَّا إِلاَّ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَحَابِسٍ التَّمِيمِيِّ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ

عُمَرَ، وَسَعْدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ وَرَوَى شُعْبَةُ أَيْضًا، عَنْ سَلَمَةَ هَذَا الحَدِيثَ، سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: كَانَ سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ يَقُولُ فِي هَذَا الحَدِيثِ، وَمَا مِنَّا، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ. قَالَ سُلَيْمَانُ: هَذَا عِنْدِي قَوْلُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ وَمَا مِنَّا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شومیەتی و نوقلانەلێدان لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوەیە، هەموومان شومیەتی دەدەینە پاڵ شت لەدڵدا بەڵام خوای پەروەردگار ئەو ئەندێشەو خەیاڵانە ناهێڵێ لەدڵدا بەهۆی پشت بەستن بە خواوە).

١٦١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيِّ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَأُحِبُّ الفَأْلَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا الفَأْلُ؟ قَالَ: الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نە نەخۆشی تەنینەوە هەیە بەبێ ڕەزامەندی خوا، نە شومیەتی و نوقلانە لێدان هەیە، بەڵام گەشبینی و نوخشە لێدانم پێ خۆشە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەشبینی و نوخشە لێدان چییە؟ فەرمووی: (وشەیەکی چاکە).

١٦١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعْجِبُهُ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ أَنْ يَسْمَعَ: يَا رَاشِدُ، يَا نَجِيحُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەردەچوو بۆ سەرئاو پێی باش بوو گوێی لە وشەی: (يَا رَاشِد) و (يَا نَجِيح) بێ.

## ئامۆژگاری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەبارەی جەنگەوە

### ٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَصِيَّتِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْقِتَالِ

١٦١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَعَثَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ بِتَقْوَى اللهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، وَقَالَ: اغْزُوا بِسْمِ اللهِ وَفِي سَبِيلِ اللهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تُمَثِّلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، فَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ، أَوْ خِلاَلٍ، أَيَّتُهَا أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، وَادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَالتَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَإِنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، وَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ مَا يَجْرِي عَلَى الأَعْرَابِ، لَيْسَ لَهُمْ فِي الغَنِيمَةِ وَالفَيْءِ شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا، فَإِنْ أَبَوْا، فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ عَلَيْهِمْ وَقَاتِلْهُمْ، وَإِذَا حَاصَرْتَ حِصْنًا فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَاجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَمَ أَصْحَابِكَ، لأَنَّكُمْ إِنْ تَخْفِرُوا ذِمَّتَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَخْفِرُوا ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ، وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ فَلاَ تُنْزِلُوهُمْ، وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ، أَوْ نَحْوَ هَذَا. وَفِي البَاب عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ وَحَدِيثُ بُرَيْدَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، وَزَادَ فِيهِ: فَإِنْ أَبَوْا فَخُذْ مِنْهُمْ

الجِزْيَةَ، فَإِنْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ عَلَيْهِمْ. هَكَذَا رَوَاهُ وَكِيعٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ سُفْيَانَ وَرَوَى غَيْرُ مُحَمَّدِ بْنِ بَشَّارٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَهْدِيٍّ وَذَكَرَ فِيهِ أَمْرَ الجِزْيَةِ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لەباوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەسێکی دەکردە سەرکردەی سوپایەك و ڕەوانەی دەکرد، ئامۆژگاری خۆی و موسوڵمانانی دەکرد بەوەی کە لەخوای گەورە بترسن و بەچاکی لەگەڵ هاوڕێکانی ڕەفتار بکات، جا دەیفەرموو: (بەناوی خواوە بجەنگە و لەپێناوی خواداجەنگ بکە لەگەڵ ئەوانەی کە کافرن، گزی و خیانەت مەکەن لە غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگی، پەیمان مەشکێنن، لوت و گوێی کوژراوان مەبڕن، منداڵ مەکوژن، ئەگەر گەیشتی بە دوژمنەکەت لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەکان ئەوە بانگیان بکە بۆ سێ خاڵ: جا وەڵامی کامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، بانگیان بکە بۆ سەر دینی ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، لەپاشدا بانگیان بکە بۆ ئەوەی لەوڵاتی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ وڵاتی کۆچەران، پێیان ڕابگەیەنەو حاڵییان بکە ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوە ئەوەیان بۆ هەیە کە بۆ کۆچەران هەیە، وە ئەوەشیان لەسەرە کە لەسەر ئەوانە، ئەگەر ڕازی نەبوون پێیان ڕابگەیەنەو حاڵیان بکە کە ئەوان وەك موسوڵمانە دەشتەکیەکانن، ئەو حوکم و بڕیارەی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە بەسەر باوەڕدارانـدا جێبەجێ دەکرێت، هیچ لە دەستکەوتی جەنگی و تالانیان بۆ نیە مەگەر لەگەڵ موسوڵماناندا خەبات و تێکۆشان بکەن، ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوە بانگیان بکە بۆ ئەوەی سەرانە(جزیة) بدەن، ئەگەر وەڵامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون ئەوە پشت بە خوای گەورە ببەستەو داوای یارمەتی لێ بکەو لەگەڵیان بجەنگە، کاتێ دەوری قەڵایەك دەگریت خەڵکی ناو قەڵاکە داوایان لێ کردی بەرامبەر بەوەی خۆیان بدەن بەدەستەوە بەڵێن و پەیمانی

خوا و پێغەمبەری خودایان بدەیتێ، ئەو کارە مەکە، بەڵکو بە ناوی خۆت و هاوڕێکانتەوە بەڵێن و پەیمانیان پێ بدە، چونکە ئێوە ئەگەر بەڵێن و پەیمانی خۆتان و هاوڕێکانتان بشکێنن ئاسانترە لەوەی بەڵێن و پەیمانی خوا و پێغەمبەری خوا بشکێنن، هەروەها ئەگەر گەمارۆی خەڵکی قەڵایەکت دا داوایان لێ کردی لەسەر حوکم و بڕیاری خوای گەورە دابەزن و خۆیان بدەن بەدەستەوە، ئەوە تۆ دایان نەبەزێنی لەسەر حوکم و بڕیاری خوای گەورە، بەڵکو لەسەر حوکم و بڕیاری خۆت دایان بەزێنە، چونکە تۆ نازانی ئەو بڕیارەی کە دەیدەیت ڕێکە لەگەڵ حوکم و بڕیاری خوای گەورەدا یان نا).

١٦١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُغِيرُ إِلاَّ عِنْدَ صَلاَةِ الفَجْرِ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِلاَّ أَغَارَ، وَاسْتَمَعَ ذَاتَ يَوْمٍ فَسَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ: عَلَى الفِطْرَةِ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَالَ: خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ. قَالَ الحَسَنُ: وَحَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ مِثْلَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم عادەتی وابوو کە دەچوو بۆ غەزا لەگەڵ شەبەقی بەیاندا کاتی بانگی بەیانی دەیدا بەسەریاندا، لەپێشدا لەدەوروبەری ئەو شوێنەدا گوێی هەڵدەخست بزانێ بانگی بەیانی دەدەن یان نا، جا ئەگەر بانگیان بدایە هێرشی نەدەکردە سەریان، بەڵام ئەگەر بانگیان نەدایە ئەوا لەناکاو هێرشی دەکردە سەریان، ڕۆژێ گوێی لێ بوو پیاوێ دەیوت: (الله أكبر)، فەرمووی: لەسەر فیترەت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، فەرمووی: لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بوو.

# باسەکانی گەورەیی تێکۆشان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٢٠ - أَبْوَابُ فَضَائِلِ الْجِهَادِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی جیهاد و تێکۆشان

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الجِهَادِ

١٦١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يَعْدِلُ الجِهَادَ؟ قَالَ: إِنَّكُمْ لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ. فَرَدُّوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلاَثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ، فَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ مَثَلُ القَائِمِ الصَّائِمِ الَّذِي لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ، حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. وَفِي البَاب عَنِ الشِّفَاءِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ حُبْشِيٍّ، وَأَبِي مُوسَى، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأُمِّ مَالِكٍ البَهْزِيَّةِ، وَأَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: دوو تا سێ جار وترا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، چ کـارێ هاوتـای گەورەیی جیهاد و تێکۆشانە؟ هەموو جارێ دەیفەرموو: (ناتوانن)، بۆ سـێیەم جـار فەرمووی: (وێنەی ئەو کەسەی کە جیهاد دەکات لە پێناوی خوادا وەك کەسێ وایـە بەشەو شەونوێژ بکات و بەڕۆژ بەڕۆژوو بێ، بەمەرجێ بێزار و بێ تاقـەت نـەبێ لـە شەونوێژ ڕۆژووگرتن هەتا تێکۆشەرەکە لە جیهاد دەگەڕێتەوە).

١٦٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَرْزُوقٌ أَبُو بَكْرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَعْنِي يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِي هُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ، إِنْ قَبَضْتُهُ أَوْرَثْتُهُ الجَنَّةَ، وَإِنْ رَجَعْتُهُ رَجَعْتُهُ بِأَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی، واتە خوای گەورە دەفەرموێ: (تێکۆشەر لە پێناوی مندا زەمانەتی لەسەر منە: ئەگەر ڕۆحم کێشا دەیخەمە بەهەشتەوە، خۆ ئەگەر گەڕاندیشمەوە بە پاداشت و غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگەوە دەیگەڕێنمەوە).

## فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی لە سەنگەرنشینیدا دەمرێت

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ مَاتَ مُرَابِطًا

١٦٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو هَانِئٍ الخَوْلَانِيُّ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ الجَنْبِيَّ، أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ، يُحَدِّثُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلاَّ الَّذِي مَاتَ مُرَابِطًا فِي سَبِيلِ اللهِ فَإِنَّهُ يُنْمَى لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَيَأْمَنُ مِنْ فِتْنَةِ القَبْرِ، وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَجَابِرٍ وَحَدِيثُ فَضَالَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (فضَالَة)ی کوڕی عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو

مردویەك مۆری کۆتایی دەنرێت بەسەر کردەوەکانیدا تەنها کەسی سەنگەرنشین(مورابط) نەبێ، چونکە ئەو بەردەوام کردەوەکانی بۆی لەزیادبونو گەشەکردندا دەبن هەتا ڕۆژی قیامەت، وە لە فیتنەو ئازاری گۆڕ پارێزراو دەبێ).
بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (تێکۆشەر کەسێکە جیهاد بەرامبەر بە نەفسی خۆی بکات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی ڕۆژوو لەپێناوی خوا

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّوْمِ فِي سَبِيلِ اللهِ

١٦٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ زَحْزَحَهُ اللَّهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا أَحَدُهُمَا يَقُولُ: سَبْعِينَ، وَالآخَرُ يَقُولُ: أَرْبَعِينَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو الأَسْوَدِ اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ الأَسَدِيُّ الْمَدِينِيُّ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕۆژێ لەپێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت ئەوە خوای گەورە حەفتا ساڵ یان چل ساڵ لەئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە).

١٦٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الوَلِيدِ العَدَنِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ (ح) وَحَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَصُومُ عَبْدٌ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ إِلاَّ بَاعَدَ ذَلِكَ اليَوْمُ النَّارَ عَنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفًا.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیە ڕۆژێ لەپێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت بێگومان بەو ڕۆژە ڕۆژووە خوای گەورە ڕوخساری حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە).

١٦٢٤ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ جَمِيلٍ، عَنِ القَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللهِ جَعَلَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أُمَامَةَ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر بەندەیە ڕۆژێ لەپێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت خوای گەورە ئەو ڕۆژە ڕۆژووە دەکاتە خەندەقێ لەنێوان ئەو و ئاگری دۆزەخدا خەندەقەکە وەك نێوان دووری زەوی و ئاسمانە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشین لەپێناوی خوا

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ الجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنِ الرُّكَيْنِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ يُسَيْرِ بْنِ عَمِيلَةَ، عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ الرُّكَيْنِ بْنِ الرَّبِيعِ.

واتە: لە خورەیمی کوڕی فاتیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەپێناوی خوادا ببەخشێ بۆ سەرخستنی دینی خوا ئەوە یەك بە حەوت سەد زیاتری بۆ دەنوسریت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی خزمەت لەپێناوی خوا

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الخِدْمَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٢٦ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ القَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ الطَّائِيِّ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: خِدْمَةُ عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ ظِلُّ فُسْطَاطٍ، أَوْ طَرُوقَةُ فَحْلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ صَالِحٍ هَذَا الحَدِيثُ مُرْسَلاً، وَخُولِفَ زَيْدٌ فِي بَعْضِ إِسْنَادِهِ. وَرَوَى الوَلِيدُ بْنُ جَمِيلٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنِ القَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمی (طائي)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کام خێر و خێرات گەورەترینە؟ فەرمووی: (خێری ئەو بەندەیە کە خاوەنەکەی دەیدا لەپێناوی خوادا بۆ خزمەتکردنی تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا، یان سێبەری ئەو دەوارەیە کە خاوەنەکەی دەیدا لەپێناوی خوادا بە تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا، یا خێری ئەو وڵاخە سوارییە پێگەیشتو و بەرکەڵەیە کە خاوەنەکەی دەیدا لەپێناوی خوادا بۆ خزمەتکردنی تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا).

## دەربارەی ئەو کەسەی جەنگاوەرێ رێکدەخات بۆ غەزا

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا

١٦٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو زَكَرِيَّا يَحْيَى بْنُ دُرُسْتَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ فَقَدْ غَزَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی جەنگاوەرێك سازو رێکبخات بۆ جیهاد لەرێی خوادا ئەوە جیهادی کردوە، وە ئەوەی شیوێن موجاهیدێك بگرێتەوە بۆ ماڵو منداڵەکەی بەچاکە ئەوەش هەر جیهادی کردوە).

١٦٢٩ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ فَقَدْ غَزَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی جەنگاوەرێك سازو رێکبخات بۆ جیهاد لەرێی خوادا ئەوە جیهادی کردوە، وە ئەوەی شیوێن موجاهیدێك بگرێتەوە بۆ ماڵو منداڵەکەی بەچاکە ئەوەش هەر جیهادی کردوە).

١٦٣٠ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

١٦٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَرْبُ بْنُ شَدَّادٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ فَقَدْ غَزَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی جەنگاوەرێك سازو ڕێکبخات بۆ جیهاد لەرێی خوادا ئەوە جیهادی کردوە، وە ئەوەی شیوێن موجاهیدێك بگرێتەوە بۆ ماڵو منداڵەکەی بەچاکە ئەوەش هەر جیهادی کردوە).**

## دەربارەی گەورەیی کەسێ پێکانی تۆزاوی ببێت لەپێناوی خوا

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، قَالَ: لَحِقَنِي عَبَايَةُ بْنُ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، وَأَنَا مَاشٍ إِلَى الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنَّ خُطَاكَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، سَمِعْتُ أَبَا عَبْسٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُمَا حَرَامٌ عَلَى النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عَبْسٍ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَبْرٍ. وَفِي الْبَاب عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَرَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَيَزِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ هُوَ رَجُلٌ

شَامِيٌّ، رَوَى عَنْهُ الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَيَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ، وَبُرَيْدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ كُوفِيٌّ، أَبُوهُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاسْمُهُ مَالِكُ بْنُ رَبِيعَةَ. وَبُرَيْدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ سَمِعَ مِنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَرَوَى عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، أَبُو إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، وَعَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، وَيُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، وَشُعْبَةُ، أَحَادِيثَ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئەبو مەریەمەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەڕۆشتم بۆ مزگەوت عوبابەی کوڕی ریفاعەی کوڕی رافیعم رەزای خوای لێ بێ پێگەیشت فەمووی: مژدەت لێ بێ ئەو هەنگاوانەی کە دەینێی بەرەو مزگەوت لەپێناوی خوادایە، بۆ خۆم گوێم لە ئەبا عەبەس بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەپێناوی خوادا پێکانی تۆزاوی ببێت، خوای گەور پێکانی حەرام دەکات لە ئاگری دۆزەخ واتە دەیانپارێزێ).

## دەربارەی گەورەیی تۆز و غوبار لەپێناوی خوا

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الغُبَارِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمَسْعُودِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللهِ حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلاَ يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هُوَ مَوْلَى أَبِي طَلْحَةَ مَدَنِيٌّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەترسی خوا بگرێ خوای گەورە نایخاتە ئاگری دۆزەخەوە هەتا شیری دۆشراو نەگەڕێتەوە ناو گوانی

شـیردەرەكەوە، تـۆز و غوبـاری تێكۆشـان لـەپێناوی خـوا و دوكـەڵی جەهەنـەم كۆنابنەوە، واتە كەسێ لە غەزادا تـۆز و غوبـار بچـێ بەسـەریا دوكـەڵی جەهەنـەم ناچێ بەسەریدا).

## دەربارەی گەورەیی كەسێ مووی سپی بێ لەپێناوی خوادا

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، أَنَّ شُرَحْبِيلَ بْنَ السِّمْطِ، قَالَ: يَا كَعْبُ بْنَ مُرَّةَ، حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاحْذَرْ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الإِسْلَامِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَحَدِيثُ كَعْبِ بْنِ مُرَّةَ، هَكَذَا رَوَاهُ الأَعْمَشُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ وَأَدْخَلَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ كَعْبِ بْنِ مُرَّةَ فِي الإِسْنَادِ رَجُلاً، وَيُقَالُ: كَعْبُ بْنُ مُرَّةَ، وَيُقَالُ: مُرَّةُ بْنُ كَعْبٍ البَهْزِيُّ، وَقَدْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَادِيثَ.

واتە: لـە شـورەحبیلی كـوڕی (سمط)ەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: ئەی كوڕی موڕە فەرمایشـتێكمان لـە پێغەمبـەری خـواوە صـلى الله عليه وسلم بۆ باس بكە بەڵام هۆشیاربە بەبێ زیاد و كەم، فەمووی: بـۆ خـۆم گـوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەركەسـێ تـەڵێ مـووی سپی ببێ لەپێناوی خوادا ئەوە دەبێتە نور و روناكی بۆی لەڕۆژی قیامەتدا).

١٦٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ الْمَرْوَزِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ الحِمْصِيُّ، عَنْ بَقِيَّةَ، عَنْ بَحِيرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ

عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللهِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَحَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ هُوَ: ابْنُ يَزِيدَ الحِمْصِيُّ.

واتە: لە عەمری کوڕی عەبەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ تەڵێ مووی سپی ببێ لەپێناوی خوادا ئەوە دەبێتە نور و روناکی بۆی لەڕۆژی قیامەتدا).

## گەورەیی کەسێ ئەسپێ ساز و ئامادە بکات لەپێناوی خوا

### ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ ارْتَبَطَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ

١٦٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَالخَيْلُ لِثَلَاثَةٍ: هِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَهِيَ عَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي لَهُ أَجْرٌ: فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، فَيُعِدُّهَا لَهُ هِيَ لَهُ أَجْرٌ لاَ يَغِيبُ فِي بُطُونِهَا شَيْءٌ إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَجْرًا، وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ناوچاوانی ئەسپ خێر و بەرەکەتی پێوەیە هەتا ڕۆژی قیامەت، ئەسپ بۆ سیانە: بۆ کەسێ خێر و بەرەکەتە، بۆ کەسێ بەربەستە، بۆ کەسێ گوناهو تاوانە، ئەو کەسەی کە لەپێناوی خوادا بۆ غەزا بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوە خێر و بەرەکەتە هەرشتێ بچێتە سکیەوە ئیللا خوای گەورە بە ئەجر و پاداشت بۆ خاوەنەکەی دەنوسێ).

عَلِيٍّ، وَالحَارِثِ بْنِ حَسَّانَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي زَائِدَةَ، وَأَبُو يَعْقُوبَ الثَّقَفِيُّ اسْمُهُ: إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَرَوَى عَنْهُ أَيْضًا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى.

واتە: لە یونوسی کوڕی عوبەید بەندەی رزگارکراوی موحەممەدی کوڕی قاسمەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: موحەممەدی کوڕی قاسم ناردمی بۆلای بەرائی کوڕی عازیب رەزای خوای لێ بێ هەتا دەربارەی ئالآکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێ بکەم کە چۆن بووە؟ ئەویش فەرمووی: ئالآکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پارچە شالێکی چوارگۆشەبوو هێلی رەش و سپی تێدا بوو.

١٦٨١ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ وَهُوَ السَّالَحِانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ حَيَّانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مِجْلَزٍ لاَحِقَ بْنَ حُمَيْدٍ يُحَدِّثُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتْ رَايَةُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَوْدَاءَ، وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: ئالآکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رەش بوو، لیواکەشی سپی بوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دروشم لەکاتی جەنگدا

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشِّعَارِ

١٦٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ، عَمَّنْ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنْ بَيَّتَكُمُ العَدُوُّ، فَقُولُوا: حم لاَ يُنْصَرُونَ: وَفِي البَاب عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَهَكَذَا رَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ مِثْلَ رِوَايَةِ الثَّوْرِيِّ، وَرُوِيَ عَنْهُ عَنِ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتـە: لـە پێغەمبـەرەوە صـلی الله علیـە وسـلم دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: (ئەگەر دوژمن بەشەو لەناکاو دای بەسەرتاندا و تێکەڵاو بوون کوشتار دەسـتی پـێ کرد با دروشم و نهێنی شەوتان (حم لاَ یُنْصَرُون) بێت.

## دەربارەی چۆنیەتی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ سَيْفِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

١٦٨٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ شُجَاعٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ الحَدَّادُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ: صَنَعْتُ سَيْفِي عَلَى سَيْفِ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، وَزَعَمَ سَمُرَةُ أَنَّهُ صَنَعَ سَيْفَهُ عَلَى سَيْفِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ حَنَفِيًّا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ تَكَلَّمَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ فِي عُثْمَانَ بْنِ سَعْدٍ الكَاتِبِ وَضَعَّفَهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: شمشێرەکەم لەسەر شێوەی شمشێرەکەی سەمورەی کوڕی جوندوب دروست کـرد، چـونکە سـەمورە پێـی وابـوو شمشێرەکەی لەسـەر شـێوەی شمشـێرەکەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم دروست کردووە، کە حەنەفی بوو.

## دەربارەی بە رۆژوو نەبوون لەکاتی جەنگدا

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفِطْرِ عِنْدَ القِتَالِ

١٦٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ عَطِيَّةَ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ قَزَعَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: لَمَّا بَلَغَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الفَتْحِ مَرَّ الظَّهْرَانِ، فَآذَنَنَا

بِلِقَاءِ العَدُوِّ فَأَمَرَنَا بِالفِطْرِ، فَأَفْطَرْنَا أَجْمَعُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: لە سالی ڕزگاركردنی مەككەدا كاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم گەیشتە (مَـرَّ الظَّهْـرَانِ) - شـیوێكە لـەنێوان مەككـە و عەسـەفاندا - پێـی ڕاگەیاندین كە ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە لەبەرئەوە فەرمانی پێ كـردین بـەڕۆژوو شكاندن، جا هەمووـمان ڕۆژووەكانمان شكاند.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرچوون لەكاتی ترسدا

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُرُوجِ عِنْدَ الفَزَعِ

١٦٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: رَكِبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ يُقَالُ لَهُ: مَنْدُوبٌ، فَقَالَ: مَا كَانَ مِنْ فَزَعٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالیكــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: لە مەدینـە هـاوار و نالّەیـەكی ترسـناك هـات — وەك بلّێـی دوژمـن هێرش بكاتە سەر شاری مەدینە - ، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم بـە پەلە سـواری ئەسـپەكەی ئـەبو (طَلْحَة) بـوو كـە پێیـان دەوت: مەنـدوب، لـەپێش خەلّكەكەوە ئازایانە بە تەنیا بەرەو پێری هاوار و نالّەكە ڕۆشت بزانێ چی یە، كاتێ كە هاتەوە فەرمووی: (هیچمان نەدی، یان هاوار و نالّەی ترسناكمان نـەدی، بـەلّكو ئەم ئەسپە ئەوەندە بە هەلّمەتە وەك شەپۆلی دەریا وایە).

١٦٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، وَأَبُو دَاوُدَ قَالُوا: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ فَزَعٌ بِالمدِينَةِ فَاسْتَعَارَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَسًا لَنَا، يُقَالُ لَهُ: مَنْدُوبٌ، فَقَالَ: مَا رَأَيْنَا مِنْ فَزَعٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: لە مەدینـە هـاوار و ناڵەیـەكی ترسـناك هـات — وەك بڵێـی دوژمـن هێـرش بكاتـە سـەر شـاری مەدینـە - ، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم ئەسپێكی لە ئێمە وەرگرت - ئـەبو (طَلْحَة) مێـردی دایكـی بـوو - پێیـان دەوت: مەندوب، بە پەلە سواری بوو لـەپێش خەڵكەكـەوە ئازایانـە بـە تـەنیا بـەرەو پـیری هاوار و ناڵەكە ڕۆشت بزانێ چی یە، كاتێ كە هاتەوە فـەرمووی: (هیچـمان نـەدی، یان هاوار و ناڵەی ترسناكمان نەدی، بـەڵام ئـەم ئەسـپە ئەوەنـدە بـە هەڵمەتـە وەك شەپۆلی دەریا وایە).

١٦٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَجْرَأِ النَّاسِ، وَأَجْوَدِ النَّاسِ، وَأَشْجَعِ النَّاسِ. قَالَ: وَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ لَيْلَةً سَمِعُوا صَوْتًا، قَالَ: فَتَلَقَّاهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، وَهُوَ مُتَقَلِّدٌ سَيْفَهُ، فَقَالَ: لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَجَدْتُهُ بَحْرًا يَعْنِي: الفَرَسَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوێرترین كەس و بەخشندەترین و سەخی ترین كەس و ئازاو دلێرترین كەس بوو. فـەرمووی: بێگومـان شـەوێك لـە خەڵكی مەدینە دەنگی هاوار و ناڵەیـەكی ترسـناكیان گـوێ لـێ بـوو زۆر ترسـان و شڵەژان، فەرمووی: خەڵكەكە ڕۆشتن بەرەو پیری هاوار و ناڵەكە پێغەمبەری خوایـان

صلی الله علیە وسلم پێگەیشت لەوسەرەوە دەهاتەوە بەسواری ئەسپێکی ئەبو (طَلْحَة) ئەوەندە بە پەلە رۆشت بوو جلی نەکردبوو پشتی ئەسپەکەی رووت بوو، شمشێرەکەی لەملیدا بوو، فەرمووی: (مەشڵەژێن، مەشڵەژێن، هیچمان نەدی کە ببێت بەهۆی ترس و شڵەژان، ئەم ئەسپە وەك شەپۆلی دەریا وایە ئەوەندە گورج و گۆڵە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دامەزراوی لەکاتی جەنگدا

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّبَاتِ عِنْدَ القِتَالِ

١٦٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ بِنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ لَنَا رَجُلٌ: أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟ قَالَ: لاَ وَاللهِ، مَا وَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَكِنْ وَلَّى سَرَعَانُ النَّاسِ تَلَقَّتْهُمْ هَوَازِنُ بِالنَّبْلِ، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى بَغْلَتِهِ، وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ آخِذٌ بِلِجَامِهَا، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ پێی وتین: ئەی ئەبو عومارە ئایا ئێوە هەڵهاتن و راتان کرد دەوری پێغەمبەری خواتان صلی الله علیە وسلم چۆلکرد؟ فەرمووی: نا سوێند بە (الله)، بەڵکو تیربارانی هەوازن ئەوەندە زۆر بوو ئەوانەی پێشڕەویان کردبوو گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە سواری ئێسترەکەیەوە بوو، ئەبو سوفیان رەشمەکەی گرتبوو، دەیفەرموو: (من پێغەمبەرم درۆ ناکەم، من لەنەوەی (عبد المطلب)م).

١٦٨٩ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيُّ البَصْرِيُّ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا يَوْمَ حُنَيْنٍ وَإِنَّ الْفِئَتَيْنِ لَمُوَلِّيَتَيْنِ، وَمَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِائَةُ رَجُلٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: بێگومان ئێمەت دەبینی وەك دوو دەستە و تاقمی پشـت لەیـەك هـەڵکردوو، سـەد کەس لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله علیه وسلم نەمابوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رازاندنەوەی شمشێرەکان

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السُّيُوفِ وَحِلْيَتِهَا

١٦٩٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ صُدْرَانَ أَبُو جَعْفَرٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا طَالِبُ بْنُ حُجَيْرٍ، عَنْ هُودِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ جَدِّهِ مَزِيدَةَ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الفَتْحِ وَعَلَى سَيْفِهِ ذَهَبٌ وَفِضَّةٌ، قَالَ طَالِبٌ: فَسَأَلْتُهُ عَنِ الفِضَّةِ؟ فَقَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ السَّيْفِ فِضَّةً. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَجَدُّ هُودٍ: اسْمُهُ مَزِيدَةُ العَصَرِيُّ.

واتە: لە مەزیدەوە رەزای خوای لێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: لـەرۆژی رزگارکردنی مەککەدا کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم چووە ناو شارەوە شمشێرەکەی ئاڵتون و زیوی تێ گیرابـوو، (طالـب) فـەرمووی: دەربـارەی زیـو لـێم پرسی؟ فەرمووی: مشتی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسـلم زیـوی تێ گیرابوو.

١٦٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ فِضَّةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ فِضَّةٍ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: مشتی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زیوی تێ گیرابوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی درع

## ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدِّرْعِ

١٦٩٢ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ قَالَ: كَانَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِرْعَانِ يَوْمَ أُحُدٍ، فَنَهَضَ إِلَى الصَّخْرَةِ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ، فَأَقْعَدَ طَلْحَةَ تَحْتَهُ، فَصَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الصَّخْرَةِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: أَوْجَبَ طَلْحَةُ. وَفِي الْبَاب عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ، وَالسَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ.

واتە: لە زوبێری کوڕی عەوامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو درعی پۆشی بوو، هەستا بچێتە سەر بەردێکی گەورە نەیتوانی، (طلحة) پشتی بۆ دانەواند بەسەر پشتی ئەودا سەرکەوتە سەر بەردەکە، فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: ((طلحة) بەهەشتی مسۆگەر

كرد).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی كڵاو و زریە

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمِغْفَرِ

١٦٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ، فَقِيلَ لَهُ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الكَعْبَةِ، فَقَالَ: اقْتُلُوهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ لاَ نَعْرِفُ كَبِيرَ أَحَدٍ رَوَاهُ، غَيْرَ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە ناو شاری مەككەوە لەڕۆژی ڕزگاركردنیدا كڵاو و زریەیەكی لەسەردا بوو، كە كڵاو و زریەكەی لەسەری داكەند، پێی وترا: (ابْنُ خَطَل) پەنای بردۆتە بەر كەعبە، فەرمووی: (بیكوژن).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەسپ

١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الخَيْلِ

١٦٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْثَرُ بْنُ القَاسِمِ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ البَارِقِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخَيْرُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِي الخَيْلِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ الأَجْرُ وَالمَغْنَمُ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَرِيرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ، وَالمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، وَجَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ

صَحِيحٌ. وَعُرْوَةُ هُوَ ابْنُ أَبِي الجَعْدِ البَارِقِيُّ، وَيُقَالُ: هُوَ عُرْوَةُ بْنُ الجَعْدِ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: وَفِقْهُ هَذَا الحَدِيثِ أَنَّ الجِهَادَ مَعَ كُلِّ إِمَامٍ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ.

واتە: لە عوروەی بارەقیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خێر و پاداشت و غەنیمەت بەسراوە بە یاڵەکانی ئەو ئەسپەوە کە ئامادەکراوە بۆ جیهاد هەتا ڕۆژی قیامەت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چ جۆرە ئەسپێ چاکە

٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الخَيْلِ

١٦٩٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الصَّبَّاحِ الهَاشِمِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَيْبَانُ يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُمْنُ الخَيْلِ فِي الشُّقْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ شَيْبَانَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خێر و بەرەکەت لە ئەسپی سوردایە).

١٦٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَيْرُ الخَيْلِ الأَدْهَمُ الأَقْرَحُ الأَرْثَمُ، ثُمَّ الأَقْرَحُ الْمُحَجَّلُ، طَلْقُ اليَمِينِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَدْهَمَ فَكُمَيْتٌ عَلَى هَذِهِ الشِّيَةِ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا

صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (چاكترین ئەسپ ئەسپی رەشی تێرە نێوچاوانی ئەوەندەی درهەمێ سپی تێدایە، بەشی سەرەوەی لمۆزی سپییە، لەپاشدا چوارپەلی سپی بێت، پەلێكی سپی نەبێت، ئەگەر ئەسپی رەشی تێر نەبوو، ئەسپێ گوێ و یالّی سپی بێ و باقیەكەی سور بێ).

١٦٩٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی چ جۆرە ئەسپێ باش نیە

### ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُكْرَهُ مِنَ الخَيْلِ

١٦٩٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنِي سَلْمُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ النَّخَعِيُّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَرِهَ الشِّكَالَ مِنَ الخَيْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ الخَثْعَمِيِّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَأَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ: اسْمُهُ هَرِمٌ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ قَالَ: قَالَ لِي إِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ: إِذَا حَدَّثْتَنِي، فَحَدِّثْنِي عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، فَإِنَّهُ حَدَّثَنِي مَرَّةً بِحَدِيثٍ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ بِسِنِينَ فَمَا أَخْرَمَ مِنْهُ حَرْفًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم حەزی لە ئەسپی (شِّكَال) نەبوو - (شِّكَال) ئەسپێكە كە قاچی راستی و دەستی چەپی سپی پێوە بێ، یان دەستی راستی و قاچی چەپی سپی پێوە بێ، واتە بە پێچەوانەوە.

## دەربارەی پێشبڕکێی ئەسپ سواری

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرِّهَانِ وَالسَّبَقِ

١٦٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَزِيرٍ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْرَى الْمُضَمَّرَ مِنَ الخَيْلِ مِنَ الحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ وَبَيْنَهُمَا سِتَّةُ أَمْيَالٍ، وَمَا لَمْ يُضَمَّرْ مِنَ الخَيْلِ مِنْ ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ وَبَيْنَهُمَا مِيلٌ، وَكُنْتُ فِيمَنْ أَجْرَى، فَوَثَبَ بِي فَرَسِي جِدَارًا. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێشبڕکێی کردوە لەنێوان ئەو ئەسپانەی کە دابەستەبوون لە (حَفْيَاء)وە هەتا (ثَنِيَّة الْوَدَاع). هەروەها پێشبڕکێی کردوە لەنێوان ئەو ئەسپانەی کە دابەستە نەبوون لە (الثَّنِيَّة)وە بۆ مزگەوتی بەنی زورەیق. خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە پێشبڕکێکەی پێ کردم ئەسپەکەم بەسەر شورای یان دیواری مزگەوتەکەدا بازی دا . - (حَفْيَاء) شوێنێکە لەنزیك مەدینە، (ثَنِيَّة الْوَدَاع)یش هەر لە مەدینەیە - .

١٧٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ نَافِعِ بْنِ أَبِي نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ سَبَقَ إِلاَّ فِي نَصْلٍ، أَوْ خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پێشبڕکێ تەنها لەمانەدا هەیە: ئەوەی خوفی

هەیە - مەبەستی وشترە - ، یان ئەوەی سمی هەیە وەك ئەسپ و ئەوانەی وەك ئەون، یا رم و تیر و شمشێر و هاوشێوەیان).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دروست نیە نێرەكەر بنرێ لە ماین

## ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ تُنْزَى الحُمُرُ عَلَى الخَيْلِ

١٧٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو جَهْضَمٍ مُوسَى بْنُ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدًا مَأْمُورًا، مَا اخْتَصَّنَا دُونَ النَّاسِ بِشَيْءٍ إِلاَّ بِثَلاَثٍ: أَمَرَنَا أَنْ نُسْبِغَ الوُضُوءَ، وَأَنْ لاَ نَأْكُلَ الصَّدَقَةَ، وَأَنْ لاَ نُنْزِيَ حِمَارًا عَلَى فَرَسٍ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ هَذَا، عَنْ أَبِي جَهْضَمٍ، فَقَالَ: عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: حَدِيثُ الثَّوْرِيِّ غَيْرُ مَحْفُوظٍ وَوَهِمَ فِيهِ الثَّوْرِيُّ وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، وَعَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي جَهْضَمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەندەیەكی فەرمان پێكراو بوو لەلایەن خواوە، ئێمەی ئال و بەیت هیچ حوكم و بڕیارێكی بۆ نەداوین بۆ ئوممەتەكەی نەدابێ، هیچ فەرمانێكی پێ نەكردووین بە ئوممەتەكەی نەكردبێ واتە تایبەتمەندیمان نیە جگە لەم سێ شتەدا نەبێ: فەرمانی پێ كردووین بە تەواوی و بە جوانی دەستنوێژ بگرین، سەدەقە و خێر و زەكات نەخۆین، نێرەكەریش نەنێین لە ماین.

## دەربارەی سەركەوتن بەهۆی هەژار و نەدارە موسوڵمانەكانەوە

٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِسْتِفْتَاحِ بِصَعَالِيكِ الْمُسْلِمِينَ

١٧٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ابْغُونِي ضُعَفَاءَكُمْ، فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەوڵم بۆ بدەن لەناو هەژار و لاوازەكان، چونكە خوای گەورە بەهۆی پەرستش و تەقواو پاڕانەوەی ئەوانەوە ڕۆزیتان پێ دەبەخشێ و سەرتان دەخات بەسەر دوژمناندا).

## دروست نیە ولاخی سواری زەنگی پێوە بێت

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الأَجْرَاسِ عَلَى الخَيْلِ

١٧٠٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلاَ جَرَسٌ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَأُمِّ حَبِيبَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیكە هاوڕێیەتی ئەو كاروانی و كۆمەڵانە ناكەن كە سەگ و زەنگیان پێ بێت).

## دەربارەی کێ دەکرێت بە سەرکردە لە جەنگدا

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ مَنْ يُسْتَعْمَلُ عَلَى الحَرْبِ

١٧٠٤ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَحْوَصُ بْنُ الجَوَّابِ أَبُو الجَوَّابِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ البَرَاءِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ جَيْشَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَى أَحَدِهِمَا عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَعَلَى الآخَرِ خَالِدَ بْنَ الوَلِيدِ، فَقَالَ: إِذَا كَانَ القِتَالُ فَعَلِيٌّ، قَالَ: فَافْتَتَحَ عَلِيٌّ حِصْنًا فَأَخَذَ مِنْهُ جَارِيَةً، فَكَتَبَ مَعِي خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشِي بِهِ، فَقَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَرَأَ الكِتَابَ، فَتَغَيَّرَ لَوْنُهُ، ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَى فِي رَجُلٍ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قَالَ: قُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِ اللهِ، وَغَضَبِ رَسُولِهِ، وَإِنَّمَا أَنَا رَسُولٌ، فَسَكَتَ. وَفِي البَابِ. عَنِ ابْنِ عُمَرَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الأَحْوَصِ بْنِ جَوَّابٍ قَوْلُهُ: يَشِي بِهِ، يَعْنِي: النَّمِيمَةَ.

واتە: لە بەرائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو سوپای ڕەوانەکرد بۆ جەنگ، یەکێکیان بە سەرکردایەتی پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ ئەوی تریشیان بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید ڕەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: (ئەگەر جەنگ بەرپا بوو ئەوە با پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ سەرکردایەتی جەنگەکە بکات)، جا پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ قەڵایەکی ڕزگار کرد هەندێ ئافرەتیان گرت بە سەبایا یەکێکیانی هەڵبژارد بۆ خۆی، خالید نامەیەکی بە مندا نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دوو زمانی کرد، کاتێ نامەکەی خالید خوێنرایەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕەنگی تێك چوو، لەپاشدا فەرمووی: (چۆن دەبینن پیاوێ خواو پێغەمبەری خۆش دەوێ و خواو

پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ؟)، براء فەرمووی: منیش وتم: پەنادەگرم بـە خـوا لە تورەیی خواو لە تـورەیی پێغەمبەرەکـەی، مـن نێـردراوم، جـا پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم بێدەنگ بوو.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوا

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِمَامِ

١٧٠٥ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالمرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُ، وَالعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي مُوسَى. وَحَدِيثُ أَبِي مُوسَى غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَحَدِيثُ أَنَسٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَحَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. رَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ بَشَّارٍ الرَّمَادِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَخْبَرَنِي بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بِنِ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ بَشَّارٍ. قَالَ مُحَمَّدُ: وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَهَذَا أَصَحُّ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَرَوَى إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ سَائِلٌ كُلَّ رَاعٍ عَمَّا اسْتَرْعَاهُ سَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: هَذَا غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَإِنَّمَا الصَّحِيحُ عَنْ مُعَاذِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خـوا

صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن ئێوە هەمووتان شوانن و چاودێرن وە هەمووتان بەرپرسن لەژێردەستەکانتان، پێشەوا شوان و چاودێرە بەسەر خەڵکەوەو بەرپرسە لێیان، پیاو شوان و چاودێرە لەناو خانەوادەکەیدا و بەرپرسە لێیان، ژن شوان و چاودێرە بەرپرسیارە لە ماڵ و منداڵی مێردەکەی، بەندە شوان و چاودێرە بەرپرسیارە لە ماڵی گەورەکەی، وە ئێوە هەمووتان شوانن و چاودێرن وە هەمووتان بەرپرسن لەژێردەستەکانتان).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەرمانبەرداری پێشەوا

٢٨ – بَابُ مَا جَاءَ فِي طَاعَةِ الإِمَامِ

١٧٠٦ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ العَيْزَارِ بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أُمِّ الحُصَيْنِ الأَحْمَسِيَّةِ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، وَعَلَيْهِ بُرْدٌ قَدِ التَفَعَ بِهِ مِنْ تَحْتِ إِبْطِهِ، قَالَتْ: فَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى عَضَلَةِ عَضُدِهِ تَرْتَجُّ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ، وَإِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ مُجَدَّعٌ فَاسْمَعُوا لَهُ، وَأَطِيعُوا مَا أَقَامَ لَكُمْ كِتَابَ اللَّهِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ أُمِّ حُصَيْنٍ.

واتە: لە ئوممو حوصەینی ئەحمەسییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو لە حەجی ماڵاوایدا عەبایەکی پێچابوو بە خۆیەوە وتاری دەدا دەمبینی قۆڵی دەجولاند دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن، گوێ بگرن بۆ پێشەواو کاربەدەستان و فەرمانبەرداری بکەن با بەندەیەکی حەبەشی لوت و گوێ بڕاویش بێ، مادەم بە قورئان حوکم بکات.

## ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ کەس نییە لە نافەرمانی خوادا

٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ

١٧٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ عَلَيْهِ وَلاَ طَاعَةَ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَالحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو الغِفَارِيِّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسی موسوڵمان دەبێت ملکەچ و گوێڕایەڵ بێت لەو شتەی پێی خۆشەو لەوەش کە پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمانی بە گوناهو تاوان پێ بکرێت، ئەگەر فەرمانی بە گوناهو تاوان پێ کرا، ئەوە نەملکەچی لەسەرە نە گوێڕایەڵی).

## دەربارەی بە شەڕدانی ئاژەڵان و لێدان و داخ کردنیان کە دروست نیە

٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّحْرِيشِ بَيْنَ البَهَائِمِ وَالضَّرْبِ وَالوَسْمِ فِي الوَجْهِ

١٧٠٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ قُطْبَةَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّحْرِيشِ بَيْنَ البَهَائِمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی ئاژەڵان بەشەڕ بدرێن.

١٧٠٩ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ التَّحْرِيشِ بَيْنَ البَهَائِمِ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَيُقَالُ: هَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ قُطْبَةَ، وَرَوَى شَرِيكٌ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي يَحْيَى. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَبُو كُرَيْبٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ آدَمَ، عَنْ شَرِيكٍ، وَرَوَى أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَرَوَاهُ ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، مَرْفُوعًا وَأَبُو يَحْيَى هُوَ القَتَّاتُ الكُوفِيُّ، وَيُقَالُ اسْمُهُ: زَاذَانُ. وَفِي البَاب عَنْ طَلْحَةَ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعِكْرَاشِ بْنِ ذُؤَيْبٍ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی ئاژەڵان بەشەڕ بدرێن.

١٧١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الوَسْمِ فِي الوَجْهِ وَالضَّرْبِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لە لێدان و داخکردنی روخساری ئاژەڵان و گیانەوەران.

## دەربارەی باڵغ بوونی منداڵ و کەی فەرزی لەسەرە

### ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ بُلُوغِ الرَّجُلِ، وَمَتَى يُفْرَضُ لَهُ

١٧١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الوَزِيرِ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ:

عُرِضْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَيْشٍ وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ فَلَمْ يَقْبَلْنِي، ثُمَّ عُرِضْتُ عَلَيْهِ مِنْ قَابِلٍ فِي جَيْشٍ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فَقَبِلَنِي قَالَ نَافِعٌ: فَحَدَّثْتُ بِهَذَا الحَدِيثِ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ، فَقَالَ: هَذَا حَدُّ مَا بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ، ثُمَّ كَتَبَ أَنْ يُفْرَضَ لِمَنْ بَلَغَ الخَمْسَ عَشْرَةَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ هَذَا حَدُّ مَا بَيْنَ الذُّرِّيَّةِ وَالمُقَاتِلَةِ وَلَمْ يَذْكُرْ أَنَّهُ كَتَبَ أَنْ يُفْرَضَ. حَدِيثُ إِسْحَاقَ بْنِ يُوسُفَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ.

واته: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا چواردە ساڵان بووم برامە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی بەشداری جەنگەکە بکەم ڕێگەی پێ نەدام، بەڵام بۆ ساڵی ئایندە لەرۆژی (خەندەق)دا پانزە ساڵان بووم برامە خزمەتی ڕێگەی پێ دام بەشداری بکەم، ئەمەیان گێڕایەوە بۆ عومەری کوڕی (عبد العزیز) فەرمووی: ئەمە حەددی نێوان گەورە و بچوکە، جا نامەی نووسی بۆ سەرکارەکانی و ناردی بۆیان کە هەرکەسێ تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ ناوی تۆمار بکەن لە دیوان و فەرزی لەسەرە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێ شەهید بێت و قەرزار بێ

## ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُسْتَشْهَدُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ

١٧١٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَامَ فِيهِمْ، فَذَكَرَ لَهُمْ: أَنَّ الجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَالإِيمَانَ بِاللهِ أَفْضَلُ

الأَعْمَالِ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ، يُكَفِّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ، إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَيْفَ قُلْتَ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَيُكَفِّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَعَمْ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ، إِلاَّ الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيلَ قَالَ لِي ذَلِكَ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَمُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا. وَرَوَى يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبی قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد، باسی ئەوەی بۆ کردن کە جیهاد لە ڕێی خوا و باوەڕهێنان بە خوا گەورەترین کردەوەی چاکەن، پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! ئەگەر لە ڕێی خوادا بکوژرێم ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانم و خوا لێم خۆش دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر دامەزراو و خۆڕاگر بیت و ڕوو بەڕووی دوژمن بجەنگی و پشت نەکەیتە جەنگ). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چیت وت؟) وتم: ئەگەر لە ڕێی خوادا بکوژرێم ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانم و خوا لێم خۆش دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر دامەزراو و خۆڕاگر بیت و ڕوو بەڕووی دوژمن بجەنگی و پشت نەکەیتە جەنگ، جگە لە قەرز، جبریل ئەوەی پێ فەرمووم).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ناشتنی تەرمی شەهیدەکان

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دَفْنِ الشُّهَدَاءِ

١٧١٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ مَرْوَانَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَبِي الدَّهْمَاءِ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: شُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجِرَاحَاتُ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: احْفِرُوا، وَأَوْسِعُوا، وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ، وَقَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا، فَمَاتَ أَبِي، فَقُدِّمَ بَيْنَ يَدَيْ رَجُلَيْنِ. وَفِي البَاب عَنْ خَبَّابٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَغَيْرُهُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ. وَأَبُو الدَّهْمَاءِ: اسْمُهُ قِرْفَةُ بْنُ بُهَيْسٍ أَوْ بَيْهَسٍ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عامیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یاریدەدەران لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا هاتن سکالآیان هێنایە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەو هەموو کوژراوانە، وتیان: فەرمانت بە چی یە؟ ئەویش فەرمووی: (چاڵ بکەنن و فراوانی بکەن و چاکی بکەن و دوو دوو سێ سێ بیاننێژن لە گۆڕێکدا، ئەوەیان کە زیاتر قورئانی لەبەرە پێشی بخەن بۆ ناو گۆڕ). وتی: ئەوکاتە (عامیر)باوکم کوژرا بوو لەگەڵ دوو کەس خرانە ناو گۆڕێکەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پرس و را

### ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَشُورَةِ

١٧١٤ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَجِيءَ بِالأُسَارَى، قَالَ

رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَؤُلاَءِ الأُسَارَى فَذَكَرَ قِصَّةً فِي هَذَا الحَدِيثِ طَوِيلَةً. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَأَبِي أَيُّوبَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَأَبُو عُبَيْدَةَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِيهِ وَيُرْوَى عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ مَشُورَةً لأَصْحَابِهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عبد الله)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: لە رۆژی جەنگی بەدردا دیلەكانیان هێنایە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: لەبارەی ئەم دیلانەوە ئێوە دەڵێن چی؟ جا راوی بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: هیچ كەسێكم نەدیوە هێندەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرس و رای كردبێ بە هاوەڵانی.

## دەربارەی لاشەی دیل ناكۆڕرێتەوە بە ماڵ و سامان

### ٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تُفَادَى جِيفَةُ الأَسِيرِ

١٧١٥ - (**ضعيف الإسناد**) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ الْمُشْرِكِينَ أَرَادُوا أَنْ يَشْتَرُوا جَسَدَ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَبَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعَهُمْ إِيَّاهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحَكَمِ وَرَوَاهُ الحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ أَيْضًا، عَنِ الحَكَمِ. وقَالَ أَحْمَدُ بْنُ الْحَسَنِ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: ابْنُ أَبِي لَيْلَى لاَ يُحْتَجُّ بِحَدِيثِهِ وقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: ابْنُ أَبِي لَيْلَى صَدُوقٌ، وَلَكِنْ لاَ نَعْرِفُ صَحِيحَ حَدِيثِهِ مِنْ سَقِيمِهِ، وَلاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئًا، وَابْنُ أَبِي لَيْلَى صَدُوقٌ فَقِيهٌ، وَرُبَّمَا يَهِمُ

فِي الإِسْنَادِ. حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: فُقَهَاؤُنَا ابْنُ أَبِي لَيْلَى وَعَبْدُ اللهِ بْنُ شُبْرُمَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە هاوبەش بۆ خوا دانەران ویستیان لاشەی پیاوێکی هاوبەش بۆ خوا دانەر بکڕنەوە، بەلاّم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قبولّی نەکرد پێیان بفرۆشێت.

## دەربارەی پشتکردنە جەنگ لەکاتی بەرەنگاربونەوەدا

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفِرَارِ مِنَ الزَّحْفِ

١٧١٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ، فَحَاصَ النَّاسُ حَيْصَةً، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَاخْتَبَأْنَا بِهَا وَقُلْنَا: هَلَكْنَا، ثُمَّ أَتَيْنَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، نَحْنُ الفَرَّارُونَ، قَالَ: بَلْ أَنْتُمُ العَكَّارُونَ، وَأَنَا فِئَتُكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ وَمَعْنَى قَوْلِهِ: فَحَاصَ النَّاسُ حَيْصَةً، يَعْنِي: أَنَّهُمْ فَرُّوا مِنَ القِتَالِ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ: بَلْ أَنْتُمُ العَكَّارُونَ، وَالعَكَّارُ: الَّذِي يَفِرُّ إِلَى إِمَامِهِ لِيَنْصُرَهُ لَيْسَ يُرِيدُ الفِرَارَ مِنَ الزَّحْفِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەلّ لەشکرێکدا ناردینی بۆ غەزا، کە جەنگ دەستی پیّ کرد ماوەیە بەردەوام بوو خەلّکەکە بوو بە مشت و مریان کە هەلّبێن بۆیە هەلّهاتن و گەڕانەوە بەرەو مەدینە، منیش یەکێك بووم لەوانە، کاتیّ کە گەیشتینە مەدینە لەشەرماندا خۆمان دەرنەخست پەشیمان بوینەوە و وتمان: چیمان کرد بەخۆمان تیاچووین، لەپاشدا چووین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتمان: ئێمە لەجەنگ هەلّهاتووین، فەرمووی: (نەخێر، بەلّکو ئێوە

دەتانەوێ جارێکی تر هێرش ببەنەوە سەر دوژمنەکەتان، منیش لە کۆمەڵەکەتانم).

## دەربارەی ناشتنی کوژراو هەر لەو شوێنەدا کە کوژراوە.

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دَفْنِ القَتِيلِ فِي مَقْتَلِهِ

١٧١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ نُبَيْحًا العَنَزِيَّ يُحَدِّثُ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ جَاءَتْ عَمَّتِي بِأَبِي لِتَدْفِنَهُ فِي مَقَابِرِنَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رُدُّوا القَتْلَى إِلَى مَضَاجِعِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَنُبَيْحٌ ثِقَةٌ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە جەنگی ئوحوددا پورم هات بۆ ئەوەی لاشەی باوکم بباتەوە لە مەدینە لەگۆڕستانی خۆماندا بینێژن، جاڕدەرەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانتان پێ دەکات بەوەی کە کوژراوەکان بگەڕێننەوە و لە جێگەی خۆیاندا بیانێژن - ئێمەش گەڕاندمانەوە بۆ جێگەی خۆیان و هەر یەکەو لە جێگەی خۆیدا بە جل و بەرگی خۆیانەوە ناشتمانن واتە لەو جێگەیەدا کە شەهید بووبوون.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشوازی کەسێ بگەڕێتەوە

٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَلَقِّي الغَائِبِ إِذَا قَدِمَ

١٧١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ تَبُوكَ خَرَجَ النَّاسُ يَتَلَقَّوْنَهُ إِلَى ثَنِيَّةِ الوَدَاعِ، قَالَ السَّائِبُ: فَخَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ وَأَنَا غُلاَمٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە غەزای تەبوك گەڕایەوە بۆ مەدینە، خەڵکی مەدینە چونە پێشوازی لە دەربەندی وەداع(ثَنِيَّةِ الْوَدَاع)، سائیب فەرمووی: ئەو کاتە من منداڵ بووم لەگەڵ خەڵکەکە چووم بۆ پێشوازی.

## دەربارەی دەستکەوتی ماڵی کافران بەبێ جەنگ

### ٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفَيْءِ

١٧١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الحَدَثَانِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ يَقُولُ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ، مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، وَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالِصًا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْزِلُ نَفَقَةَ أَهْلِهِ سَنَةً، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي الكُرَاعِ وَالسِّلاَحِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَى سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ.

واتە: لە مالیکی کوڕی ئەوسەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بوو دەیفەرموو: ماڵی (بنی نضیر) لەو ماڵانە بوو کە خوای گەورە بە (فيء) تەرخانی کردبو بۆ پێغەمبەرەکەی، موسوڵمانان بۆ بەدەستهێنانی خۆیان ماندو نەکردبو، هیچ ئەسپ و وشترێکیان بۆ تاو نەدابو، بەڵکو بەبێ جەنگ دەستیان کەوتبو، بە تەنها تایبەت بوو بە پێغەمبەری خواوە صلى الله

علیه وسلم، ئەویش بەشی خەرجی ساڵێکی بۆ خۆی و خاوخێزانی دانا، ئەوەشی کە مایەوە چەك و ئەسپ و وڵاخی سواری پێ کڕی بۆ ئامادەکاری لەرێی خوای گەورەدا.

# باسەكانی پۆشاك لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم

## ٢٢ - أَبْوَابُ اللِّبَاسِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاوریشم و زێڕ

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَرِيرِ وَالذَّهَبِ

١٧٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حُرِّمَ لِبَاسُ الحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَنَسٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَأُمِّ هَانِئٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي رَيْحَانَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَالبَرَاءِ. وَحَدِيثُ أَبِي مُوسَى حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەبەركردنی پۆشاكی ئاوریشم و بەكارهێنانی زێڕ حەرامە بۆ نێرینەی ئوممەتی من بەلاّم بۆ مێینەی ئوممەتی من حەلاڵە).

١٧٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، عَنْ عُمَرَ، أَنَّهُ خَطَبَ بِالجَابِيَةِ فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الحَرِيرِ، إِلاَّ مَوْضِعَ أُصْبُعَيْنِ، أَوْ ثَلاَثٍ، أَوْ أَرْبَعٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لە جابیەی شام وتاریدا فەرمووی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردووە لە ئاوریشم جگە لـە ئەنـدازەی دوو یان سێ یا چوار پەنجە نەبێ.

## رێگەدان بە لەبەركردنی پۆشاكی ئاوریشم لەجەنگدا

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي لُبْسِ الحَرِيرِ فِي الحَرْبِ

١٧٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرَ بْنَ العَوَّامِ، شَكَيَا القَمْلَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزَاةٍ لَهُمَا، فَرَخَّصَ لَهُمَا فِي قُمُصِ الحَرِيرِ، قَالَ: وَرَأَيْتُهُ عَلَيْهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لـە ئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە لـە غەزایەكدا (عبد الرحمن)ی كوڕی عەوف و زوبێری كوڕی عـەوام ڕەزای خوایـان لـێ بێ لـە خزمـەت پێغەمبـەردا صـلی الله علیـە وسـلم سـكاڵای حـاڵی خۆیـان كـرد لەدەست ئەسپێ، ئەویش ڕێگەی پێدان پۆشاكی ئاوریشم لەبەربكەن، فەرمووی: لە بەریاندا بینیم.

٣ - بَابٌ

١٧٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا وَاقِدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، قَالَ: قَدِمَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: أَنَا وَاقِدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، قَالَ: فَبَكَى، وَقَالَ: إِنَّكَ لَشَبِيهٌ بِسَعْدٍ، وَإِنَّ سَعْدًا كَانَ مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ وَأَطْوَلِهِمْ، وَإِنَّهُ بُعِثَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جُبَّةٌ مِنْ دِيبَاجٍ مَنْسُوجٌ فِيهَا الذَّهَبُ، فَلَبِسَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَقَامَ، أَوْ قَعَدَ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَلْمِسُونَهَا، فَقَالُوا:

مَا رَأَيْنَا كَالْيَوْمِ ثَوْبًا قَطُّ، فَقَالَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذِهِ؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِمَّا تَرَوْنَ. وَفِي الْبَاب عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ. ○هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە واقیدی كوڕی عەمری كوڕی سەعدی كوڕی (معاذ)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەنەسی كوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ هاتەوە منیش چوومە خزمەتی: فەرمووی: تۆ كێی؟ وتم: من واقیدی كوڕی عەمری كوڕی سەعدی كوڕی (معاذ)م، ئەنەس دەستی كرد بە گریان و فەرمووی: تۆ زۆر لە سەعد دەچیت، بێگومان سەعد رەزای خوای لێ بێ لەناو خەڵكدا گەورەترین پلەو پایەی هەبوو، بالآی لە هەموو كەس بەرزتربوو، جوبەیەكیان لە دیباج نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رایەڵەكەی بە تەڵی ئاڵتوون چنرابوو - پێش ئەوەی ئاوریشم حەرام ببێ -، ئەویش لەبەری كرد، لەسەر مینبەر هەستا یان دانیشت، خەڵكەكە دەستیان لێ دەدا سەریان سوڕدەما لەجوانی، وتیان: هەتا ئەمڕۆ هەرگیز قوماشی ئەوەندە جوانمان نەدیوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سەرتان سوڕدەمێنێ لەجوانی ئەم پۆشاكە؟ خاولی یان دەستەسرەكەی سەعد لە بەهەشتدا لەمە جوانترە كە دەیبینن).

## دەربارەی ڕێگەدان بە پیاوان كە پۆشاكی سوور لەبەركەن

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الثَّوْبِ الأَحْمَرِ لِلرِّجَالِ

١٧٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ لَمْ يَكُنْ بِالْقَصِيرِ وَلاَ بِالطَّوِيلِ. وَفِي الْبَاب عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَأَبِي رِمْثَةَ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە بەرائەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پۆشاکێکی سوری تازەی لەبەردا بوو کەسم نەدیوە ئەوەندە جوان و پێکەوتوو بێت، قژێکی پێوە بوو دەیدا لە سەرشانی، بالاّ مامناوەندی بوو، نە بالاّی بەرز بوو نە کورتەبالاّش بوو.

## لەبەرکردنی پۆشاکی عەصفەراناوی بۆ پیاوان دروست نیە

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْمُعَصْفَرِ لِلرِّجَالِ

١٧٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ لُبْسِ القَسِّيِّ، وَالمعَصْفَرِ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَحَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی قەسی و عەصفەراناوی - ئەوەی بە گیای گەزنە رەنگ دەکرێت - لیّ قەدەغەکردم.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی فەرو

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الفِرَاءِ

١٧٢٦ - (حسن) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى الفَزَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَيْفُ بْنُ هَارُونَ البُرْجُمِيُّ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ السَّمْنِ وَالجُبْنِ وَالفِرَاءِ، فَقَالَ: الحَلاَلُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَالحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ: وَفِي البَاب عَنِ الْمُغِيرَةِ.

وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَرَوَى سُفْيَانُ، وَغَيْرُهُ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ سَلْمَانَ قَوْلَهُ وَكَأَنَّ الْحَدِيثَ الْمَوْقُوفَ أَصَحُّ وَسَأَلْتُ الْبُخَارِيَّ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَقَالَ: مَا أُرَاهُ مَحْفُوظًا، رَوَى سُفْيَانُ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ سَلْمَانَ مَوْقُوفًا، قَالَ البُخَارِيُّ: وَسَيْفُ بْنُ هَارُونَ مُقَارِبُ الحَدِيثِ، وَسَيْفُ بْنُ مُحَمَّدٍ عَنْ عَاصِمٍ ذَاهِبُ الحَدِيثِ.

واتە: لە سەلمانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە چەوری و پەنیر و فەرو پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (هەرچی خوای گەورە لە قورئانەکەیدا بە حەلاڵی داناوە ئەوە حەلاڵە، وە هەرچی خوای گەورە لە قورئانەکەیدا بە حەرامی داناوە ئەوە حەرامە هەتا هەتایە، ئەوەشی کە ناوی نەبردوەو لێی بێ دەنگ بووە ئەوە چاوپۆشی لێ کراوەو دروستە).

## دەربارەی خۆشەکردنی پێستەی مردارەوە بوو

### ٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي جُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ

١٧٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: مَاتَتْ شَاةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَهْلِهَا: أَلاَ نَزَعْتُمْ جِلْدَهَا، ثُمَّ دَبَغْتُمُوهُ فَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ.

واتە: لە (عطاء)ی کوڕی ئەبو رەباحەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ بوو دەیفەرموو: جارێ مەڕێ مرداربووبوەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خاوەنەکەی فەرموو: (ئەوە بۆچی پێستەکەیتان لێ دانەماڵی و خۆشەی بکەن و سوودی لێ وەربگرن؟).

١٧٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا فِي جُلُودِ الْمَيْتَةِ: إِذَا دُبِغَتْ فَقَدْ طَهُرَتْ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: أَيُّمَا إِهَابِ مَيْتَةٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ، إِلاَّ الكَلْبَ وَالخِنْزِيرَ، وَاحْتَجَّ بِهَذَا الحَدِيثِ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمْ: إِنَّهُمْ كَرِهُوا جُلُودَ السِّبَاعِ وَإِنْ دُبِغَ، وَهُوَ قَوْلُ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَالْحُمَيْدِيِّ، وَشَدَّدُوا فِي لُبْسِهَا وَالصَّلاَةِ فِيهَا قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: إِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ، جِلْدُ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ، هَكَذَا فَسَّرَهُ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ. وقَالَ إِسْحَاقُ: قَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: إِنَّمَا يُقَالُ: الإِهَابُ لِجِلْدِ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ. وَفِي الْبَاب عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبَّقِ، وَمَيْمُونَةَ، وَعَائِشَةَ. وَحَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرُوِيَ عَنْهُ، عَنْ سَوْدَةَ وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يُصَحِّحُ حَدِيثَ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَدِيثَ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ، وَقَالَ: أَحْتَمَلَ أَنْ يَكُونَ رَوَى ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَوَى ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ مَيْمُونَةَ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان هەر پێستەیە خۆشە بکرێت ئەوە پاکە). — جگە لەپێستی سەگ و بەراز و دڕندە -.

١٧٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَرِيفٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَالشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ قَالَ: أَتَانَا كِتَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْ لاَ تَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلاَ عَصَبٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَيُرْوَى عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ، عَنْ أَشْيَاخٍ لَهُ هَذَا الحَدِيثُ وَلَيْسَ العَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ أَنَّهُ قَالَ: أَتَانَا كِتَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِشَهْرَيْنِ وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ يَقُولُ: كَانَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ يَذْهَبُ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ لِمَا ذُكِرَ فِيهِ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِشَهْرَيْنِ، وَكَانَ يَقُولُ: كَانَ هَذَا آخِرَ أَمْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ تَرَكَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ هَذَا الحَدِيثَ لَمَّا اضْطَرَبُوا فِي إِسْنَادِهِ، حَيْثُ رَوَى بَعْضُهُمْ، فَقَالَ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ، عَنْ أَشْيَاخٍ مِنْ جُهَيْنَةَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عوکەیمەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نامەی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم بۆ هات دوو مانگ پێش ئەوەی وەفات بکات: (کە سوود وەرنەگرین لە کەوڵی مردارەوە بوو هەروەها لە ڕەگیشی).

## دەربارەی ڕاکێشانی پۆشاك بەدوای خۆدا دروست نیە

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ جَرِّ الإِزَارِ

١٧٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، وَزَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، كُلُّهُمْ يُخْبِرُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ. وَفِي البَاب عَنْ حُذَيْفَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ،

وَسَمُرَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَعَائِشَةَ، وَهُبَيْبِ بْنِ مُغَفَّلٍ، وَحَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا سەیری كەسێ ناكات جل و بەرگەكەی بەدوای خۆیدا ڕاكێشێ بۆ فیز و خۆ بە زلزانین).

## دەربارەی شۆڕی داوێنی ئافرەتان و ڕاكێشانی بەدوای خۆدا

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي جَرِّ ذُيُولِ النِّسَاءِ

١٧٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ القِيَامَةِ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَكَيْفَ يَصْنَعْنَ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟ قَالَ: يُرْخِينَ شِبْرًا، فَقَالَتْ: إِذًا تَنْكَشِفُ أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ: فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعًا، لاَ يَزِدْنَ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ جل و بەرگەكەی بەدوای خۆیدا ڕاكێشێ بۆ فیز و خۆ بە زلزانین خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا سەیری كەسێ ناكات)، ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی ئافرەتان چی لە داوێنیان بكەن؟ فەرمووی: (بستێ شۆڕی بكەن). فەرمووی: قاچیان دەردەكەوێت، فەرمووی: (دەی با یەك باڵ شۆڕی بكەن، نابێ لەوە زیاتر شۆڕی بكەن).

١٧٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَفَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أُمِّ الحَسَنِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ حَدَّثَتْهُمْ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَبَّرَ لِفَاطِمَةَ شِبْرًا مِنْ نِطَاقِهَا. وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ وَفِي هَذَا الحَدِيثِ رُخْصَةٌ لِلنِّسَاءِ فِي جَرِّ الإِزَارِ لأَنَّهُ يَكُونُ أَسْتَرَ لَهُنَّ.

واتە: لەئومو حەسەنەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، ئومو سەلەمە رەزای خوای لیّ بیّ بۆی باس كردن، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ئەندازەی بستێكی دانا بۆ (نِطَاق)كەی (فاطمة)ی كچی. (نِطَاق) پۆشاكێكە ئافرەت لەسەر سكی دایدەنیّ پشتوێنەكەی لەناوەڕاستدا لەسەری دەبەستیّ بەشی سەرەوەی شۆڕ دەكاتەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لەبەركردنی پۆشاكی خوری

### ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الصُّوفِ

١٧٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ كِسَاءً مُلَبَّدًا، وَإِزَارًا غَلِيظًا، فَقَالَتْ: قُبِضَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَيْنِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَحَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو بوردەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: عائیشە رەزای خوای لیّ بیّ هات عەبایەك و قوماشێكی ئەستووری زبری وەك شەرواڵی دەرهێنا نیشانی داین فەرمووی: كاتیّ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی كرد ئەم دوو پارچەیەی لەبەردا بوو.

١٧٣٤ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ خَلِيفَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كَانَ عَلَى مُوسَى يَوْمَ كَلَّمَهُ رَبُّهُ كِسَاءُ صُوفٍ، وَجُبَّةُ صُوفٍ، وَكُمَّةُ صُوفٍ، وَسَرَاوِيلُ صُوفٍ، وَكَانَتْ نَعْلاَهُ مِنْ جِلْدِ حِمَارٍ مَيِّتٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حُمَيْدٍ الأَعْرَجِ. وَحُمَيْدٌ: هُوَ ابْنُ عَلِيٍّ الكُوفِيُّ مُنْكَرُ الحَدِيثِ، وَحُمَيْدُ بْنُ قَيْسٍ الأَعْرَجُ الْمَكِّيُّ صَاحِبُ مُجَاهِدٍ ثِقَةٌ. وَالكُمَّةُ: القَلَنْسُوَةُ الصَّغِيرَةُ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو ڕۆژەی کە موسا قسەی لەگەڵ پەروەردگاری کرد عەبایەك و جوبەیەکی لەبەردا بوو لە خوری، کڵاوێکی خوری لەسەردا بوو، شەرواڵێکی خوری لەپێدا بوو، نەعلەکانی لەپێستی گوێدرێژی مردوو بوو).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مێزەری ڕەش

١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العِمَامَةِ السَّوْدَاءِ

١٧٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ يَوْمَ الفَتْحِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَعُمَرَ، وَابْنِ حُرَيْثٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَرُكَانَةَ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەکاتی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕۆشتە ناو شارەوە مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو.

## دەربارەی بەردانەوەی مێزەر بۆ نێو هەردوو شان

١٢ - بَابٌ فِي سَدْلِ العِمَامَةِ بَيْنَ الكَتِفَيْنِ

١٧٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُحَمَّدٍ الْمَدَنِيُّ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَسْدِلُ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، قَالَ عُبَيْدُ اللهِ: وَرَأَيْتُ القَاسِمَ، وَسَالِمًا يَفْعَلاَنِ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَلاَ يَصِحُّ حَدِيثُ عَلِيٍّ فِي هَذَا مِنْ قِبَلِ إِسْنَادِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مێزەرەکەی دەپێچایەوە بەریدایەوە بۆ نێو هەردوو شانی، نافیع فەرمووی: ئیبنو عومەریش بە هەمان شێوە. عوبەیدوڵلاش فەرمووی: قاسیم و سالیمم دی ئەوەیان دەکرد.

## ئەنگوستیلەی ئاڵتون دروست نیە بۆ پیاوان

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ خَاتَمِ الذَّهَبِ

١٧٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، وَالْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ، وَعَنْ لِبَاسِ القَسِّيِّ، وَعَنِ القِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَعَنْ لِبَاسِ الْمُعَصْفَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمانەی لێ قەدەغەکردم: لەدەستکردنی

ئەنگوستیلەی زێڕ، لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی قەسی و عەصفەراناوی ئەوەی بە گیای گەزنە ڕەنگ دەکرێت، هەروەها قورئان خوێندنیش لە ڕکوع و سەجدەدا.

١٧٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ حَمَّادٍ الْمَعْنِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصٌ اللَّيْثِيُّ، قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّهُ حَدَّثَنَا أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَمُعَاوِيَةَ. حَدِيثُ عِمْرَانَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو التَّيَّاحِ: اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ حُمَيْدٍ.

واتە: لە حەفصی (اللَّيْثِيّ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: شایەتی دەدەم کە عیمرانی کوڕی حوصەین ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدەستکردنی ئەنگوستیلەی زێڕی قەدەغەکردووە لە پیاوان.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەنگوستیلەی زیو

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خَاتَمِ الفِضَّةِ

١٧٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ وَرِقٍ، وَكَانَ فَصُّهُ حَبَشِيًّا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَبُرَيْدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە زیو بوو، نقێمەکەی حەبەشی بوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چ نقێمێ باشە

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُسْتَحَبُّ فِي فَصِّ الخَاتَمِ

١٧٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ بْنِ عُبَيْدٍ الطَّنَافِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ أَبُو خَيْثَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ فِضَّةٍ فَصُّهُ مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە زیو بوو، نقێمەكەشی لەخۆی بوو.

## دەربارەی ئەنگوستیلە كردنە دەستی ڕاست

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الخَاتَمِ فِي اليَمِينِ

١٧٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ الْمُحَارِبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، فَتَخَتَّمَ بِهِ فِي يَمِينِهِ، ثُمَّ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ اتَّخَذْتُ هَذَا الخَاتَمَ فِي يَمِينِي، ثُمَّ نَبَذَهُ، وَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَجَابِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ نَحْوَ هَذَا مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ أَنَّهُ تَخَتَّمَ فِي يَمِينِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا ئەنگوستیلەیەكیان لە ئالتون بۆ دروستكردو كردیە دەستی ڕاستی، لەپاشدا لەسەر مینبەر دانیشت، فەرمووی: (من ئەم

ئەنگوستیلەم کردە دەستی راستم، لەپاشدا دەری کردو فڕێیدا)، خەڵکەکەش ئەنگوستیلەکانیان فڕێیدا.

١٧٤٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ الصَّلْتِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ نَوْفَلٍ، قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ وَلاَ إِخَالُهُ إِلاَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: حَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ الصَّلْتِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ نَوْفَلٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە صەلتی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی نەوفەلەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئیبنو عەباسم دی ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی راستیەوە، وا ئەزانم فەرمووشی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی راستیەوە.

١٧٤٣ - (صحيح موقوف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ الحَسَنُ، وَالحُسَيْنُ يَتَخَتَّمَانِ فِي يَسَارِهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: حەسەن و حوسەین ئەنگوستیلەیان دەکردە دەستی چەپیانەوە.

١٧٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ أَبِي رَافِعٍ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ جَعْفَرٍ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ، وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: هَذَا أَصَحُّ شَيْءٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَابِ.

واتە: لە حەممادی کوڕی سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئیبنو ئەبو رافیعم دی ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی ڕاستیەوە، لەوبارەوە لێم پرسی، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی ڕاستیەوە.

١٧٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَنَعَ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، فَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، ثُمَّ قَالَ: لاَ تَنْقُشُوا عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ: لاَ تَنْقُشُوا عَلَيْهِ، نَهَى أَنْ يَنْقُشَ أَحَدٌ عَلَى خَاتَمِهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا ئەنگوستیلەیەکیان لەزیو بۆ دروست کرد نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). لەسەر هەڵکەند. لەپاشدا فەرمووی: (هیچ کەس نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) لەسەر ئەنگوستیلەکەی هەڵنەکەنێت).

١٧٤٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، وَالحَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الخَلاَءَ نَزَعَ خَاتَمَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەچووە سەر ئاو ئەنگوستیلەکەی لەدەستی دادەکەند.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نەخشی ئەنگوستیلە

### ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نَقْشِ الخَاتَمِ

١٧٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ نَقْشُ خَاتَمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: نەخشی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم سـێ دێڕ بوو: (مُحَمَّدٌ)

دێڕێ، (رَسُولُ)دێڕێ، (اللَّهِ) دێڕێ - دێڕی یەکەم لەسەرەوە (اللَّهِ)، دێـڕی دووەم: (رَسُولُ). دوای ئەو (مُحَمَّدٌ) - .

١٧٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ نَقْشُ خَاتَمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثَةَ أَسْطُرٍ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ، وَلَمْ يَذْكُرْ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ: ثَلَاثَةَ أَسْطُرٍ. وَفِي الْبَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: نەخشی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم سـێ دێڕ بوو: (مُحَمَّدٌ) دێڕێ، (رَسُولُ) دێڕی، (اللَّهِ) دێڕێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی وێنە

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصُّورَةِ

١٧٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصُّورَةِ فِي الْبَيْتِ، وَنَهَى عَنْ أَنْ يُصْنَعَ ذَلِكَ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي طَلْحَةَ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أَيُّوبَ. حَدِيثُ جَابِرٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه نەهی کردووە لەدانان و هەڵواسینی وێنە لەناو ماڵدا، هەروەها نەهی کردووە لە دروستکردنی.

١٧٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ يَعُودُهُ، قَالَ: فَوَجَدْتُ عِنْدَهُ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ، قَالَ: فَدَعَا أَبُو طَلْحَةَ إِنْسَانًا يَنْزِعُ نَمَطًا تَحْتَهُ، فَقَالَ لَهُ سَهْلٌ: لِمَ تَنْزِعُهُ؟ فَقَالَ: لأَنَّ فِيهِ تَصَاوِيرَ، وَقَدْ قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا قَدْ عَلِمْتَ، قَالَ سَهْلٌ: أَوَلَمْ يَقُلْ إِلاَّ مَا كَانَ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ، فَقَالَ: بَلَى، وَلَكِنَّهُ أَطْيَبُ لِنَفْسِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عوبەیدوڵای کوڕی (عبد الله)ی کوڕی عوتبەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو (طلحة) رەزای خوای لیّ بیّ نەخۆش بوو چووە بۆ سەردانی، فەرمووی: لەوکاتەدا سەهلی کوڕی حونەیفی لیّ بوو، فەرمووی: ئەبو (طلحة) جۆرە فەرشێکی نەرمی لەژێردا بوو، بانگی کرد دەریان هێنا، سەهل فەرمووی: ئەوە بۆ چی دەریان هێنا لەژێرتدا؟ فەرمووی: وێنەهای لەسەرە، خۆشت چاك دەزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی فەرمووە لەو بارەوە — مەبەستی لەم فەرمایشتەی بوو:

(مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە سەگ و وێنەی تێدا بێت) -، سەهل فەرمووی: مەگەر نەیفەرموو: (جگە لەو پۆشاکەی کە نەخشی لەسەرە؟ واتە پۆشاکێ نەخشی لەسەر بێت دروستە). فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئەمە بەلامەوە پەسەند تر و چاکترە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی وێنەگرەکان

١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُصَوِّرِينَ

١٧٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً عَذَّبَهُ اللَّهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا، يَعْنِي الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا، وَمَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ يَفِرُّونَ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَفِي البَاب عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەدونیادا وێنەی رۆح لەبەرێ بکێشێ، لەرۆژی قیامەتدا داوای لێ دەکرێ روح بکات بە بەر ئەو وێنەدا- بێگومان هەرگیز ناشتوانێ روح بکات بەبەریا - ، هەرکەسێ گوێ بگرێ بۆ چپەی کۆمەڵێ لەکاتێکدا کە ئەوان نەیانەوێ و پێیان ناخۆش بێ گوێی لێیان بێ ئەوە لەرۆژی قیامەتدا قورقوشمی سوورۆکراوی تواوە دەکرێتە ناو کرکراگەی هەردوو گوێچکەیەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گۆڕینی ڕەنگی قژ و ریش

٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخِضَابِ

١٧٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: غَيِّرُوا الشَّيْبَ وَلاَ تَشَبَّهُوا بِاليَهُودِ.وَفِي البَاب عَنِ الزُّبَيْرِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي رِمْثَةَ، وَالجَهْدَمَةِ، وَأَبِي الطُّفَيْلِ، وَجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕەنگی مووی سپی سەر و ریشتان بگۆڕن و بۆیاخی بکەن، خۆتان مەچوێنن بە جولەکەکان).

١٧٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنِ الأَجْلَحِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ الشَّيْبُ الحِنَّاءُ وَالكَتَمُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو الأَسْوَدِ الدِّيلِيُّ: اسْمُهُ ظَالِمُ بْنُ عَمْرِو بْنِ سُفْيَانَ.

واتە: لە (أبو ذر)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی باشترین شتێك مووی سپی پێ بگۆڕن خەنەو وسمەیە).

## دەربارەی مووی سەر هەتا ناوشان و نەرمایی گوێکان

### ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الجُمَّةِ وَاتِّخَاذِ الشَّعَرِ

١٧٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَبْعَةً لَيْسَ بِالطَّوِيلِ وَلاَ بِالقَصِيرِ، حَسَنَ الجِسْمِ، أَسْمَرَ اللَّوْنِ، وَكَانَ شَعْرُهُ لَيْسَ بِجَعْدٍ وَلاَ سَبْطٍ، إِذَا مَشَى يَتَكَفَّأُ وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَالبَرَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ، وَوَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، وَأُمِّ هَانِئٍ. حَدِيثُ أَنَسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ حُمَيْدٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی چوارشانەی نە درێژ بوو نە کورت، جەستەی ڕێك و جوان بوو، مووی سەری نە لول و بژ بوو نە نەرم و خاو بوو، کاتێ کە ڕێی دەکرد پێی لەزەوی هەڵدەبڕی و دایدەنا.

١٧٥٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَكَانَ لَهُ شَعْرٌ فَوْقَ الجُمَّةِ وَدُونَ الوَفْرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ هَذَا الحَرْفَ، وَكَانَ لَهُ شَعْرٌ فَوْقَ الجُمَّةِ وَدُونَ الوَفْرَةِ وَإِنَّمَا ذَكَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ وَهُوَ ثِقَةٌ حَافِظٌ، كَانَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ يُوَثِّقُهُ وَيَأْمُرُ بِالكِتَابَةِ عَنْهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە تەشتێکی گەورەدا خۆمان شت، قژێکی

پێوە بوو نە کورت بوو نە درێژ.

## نەهی کردوە لە سەر شانەکردن مەگەر رۆژێ نارۆژێ

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ التَّرَجُّلِ، إِلاَّ غِبًّا

١٧٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلاَّ غِبًّا. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الحَسَنِ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی موغەففەلەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە سەر شانەکردن مەگەر رۆژێ نارۆژێ هەتا بۆ پاك و خاوێنی بێ بۆ شەوق و زەوق نەبێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاو رشتن بە کل

٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِكْتِحَالِ

١٧٥٧ - (صحيح دون قوله: وزعم) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ مَنْصُورٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اكْتَحِلُوا بِالإِثْمِدِ فَإِنَّهُ يَجْلُو البَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَتْ لَهُ مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ بِهَا كُلَّ لَيْلَةٍ ثَلاَثَةً فِي هَذِهِ، وَثَلاَثَةً فِي هَذِهِ. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبَّادِ بْنِ مَنْصُورٍ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالاَ:

حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ مَنْصُورٍ نَحْوَهُ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە کلی ڕەش چاوتان برێژن، چونکە چاوتان پاك دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، هەروەها مووی برژانگیشتان دەڕوێنێتەوە). ئیبنو عەباس پێی وابوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کل و کلدانێکی هەبوو هەموو شەوێ چاوی دەڕشت، سێ جار دەیهێنا بە هەر چاوێکیدا.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نەهی کردن لەم دوو لەبەرکردنە: (الصَّمَّاءِ) و (الاِحْتِبَاءِ).

٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَالاِحْتِبَاءِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ

١٧٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الإِسْكَنْدَرَانِيُّ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لِبْسَتَيْنِ: الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ بِثَوْبِهِ لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لە دوو جۆر لەبەرکردن: یەکەم: (الصَّمَّاءِ) بریتیە لەوەی مرۆڤ بە پارچە قوماشێ یان جلێ خۆی شەتەك بدات بە شێوەیە کە نەتوانێ دەستی دەربهێنێت وەك چۆن منداڵ دەپێچرێتەوە، دووەم: (الاِحْتِبَاءِ) بریتیە لەوەی مرۆڤ بە جیچکانەوە جلێ بئاڵێنێ بە خۆیەوە، بەبێ ئەوەی شتێ بدات بە شەرمگەی خۆیدا.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بە قژ دانە دەم قژ.

## ٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُوَاصَلَةِ الشَّعْرِ

١٧٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الوَاصِلَةَ وَالمسْتَوْصِلَةَ، وَالوَاشِمَةَ وَالمسْتَوْشِمَةَ قَالَ نَافِعٌ: الوَشْمُ فِي اللِّثَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَمَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، وَمُعَاوِيَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە نەعلەتی کردوە لەو ژنەی قژ دەداتە دەم قژی کەسێکی تر، وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەش کە قژ دەداتە دەم قژی خۆی، هەروەها نەعلەتی کردوە لەو ژنەی کە خاڵ دەکوتێ بۆ کەسێکی تر، وە نەعلەتی کردوە لەو ژنەش کە خاڵی بۆ دەکوتن.

## سواربوونی وڵاخێکی کۆپانەکەی ئاوریشمی سوور بێ

## ٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رُكُوبِ الْمَيَاثِرِ

١٧٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ رُكُوبِ الْمَيَاثِرِ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَمُعَاوِيَةَ، وَحَدِيثُ البَرَاءِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَى شُعْبَةُ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ نَحْوَهُ، وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سواربوونی ولاخێکی لێ قەدەغەکردین کۆپانەکەی ناوریشمی سوور بێت.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەرشی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فِرَاشِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

١٧٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي يَنَامُ عَلَيْهِ أَدَمٌ، حَشْوُهُ لِيفٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَاب عَنْ حَفْصَةَ، وَجَابِرٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەو فەرشەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەری دەخەوت چەرمێکی خۆشەکراو بوو، ناواخنەکەی ریشوی دارخورما بوو.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی کراس

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القُمُصِ

١٧٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو تُمَيْلَةَ، وَالفَضْلُ بْنُ مُوسَى، وَزَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القَمِيصُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ بْنِ خَالِدٍ تَفَرَّدَ بِهِ، وَهُوَ مَرْوَزِيٌّ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي تُمَيْلَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆشەویسترین پۆشاك بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کراس بوو.

١٧٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو تُمَيْلَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القَمِيصُ وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: حَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أُمِّهِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَصَحُّ، وَإِنَّمَا يُذْكَرُ فِيهِ أَبُو تُمَيْلَةَ عَنْ أُمِّهِ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆشەویسترین پۆشاك بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کراس بوو.

١٧٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القَمِيصُ.

واتە: لە ئومو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خۆشەویسترین پۆشاك بەلای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کراس بوو.

١٧٦٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ الحَجَّاجِ الصَّوَّافُ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ بُدَيْلِ بْنِ مَيْسَرَةَ العُقَيْلِيِّ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ الأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: كَانَ كُمُّ يَدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الرُّسْغِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەر دەستی قۆڵی جل و بەرگ و کراسی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەتا موچەی دەست بوو.

١٧٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ الْجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الْوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا لَبِسَ قَمِيصًا بَدَأَ بِمَيَامِنِهِ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الإِسْنَادِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مَوْقُوفًا، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَفَعَهُ غَيْرَ عَبْدِ الصَّمَدِ بْنِ عَبْدِ الْوَارِثِ، عَنْ شُعْبَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ پۆشاکی لەبەر دەکرد لەلای راستەوە دەستی پێ دەکرد.

## کەسێ پۆشاکێکی تازە لەبەر بکات چی دەڵێ

٢٩ - بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا

١٧٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سَعِيدٍ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا سَمَّاهُ بِاسْمِهِ، عِمَامَةً، أَوْ قَمِيصًا، أَوْ رِدَاءً، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُمَرَ، وَابْنِ عُمَرَ. حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُونُسَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ الْمُزَنِيُّ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ نَحْوَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە پۆشاکێکی تازەی لەبەردەکرد ناوی دەبرد بەناوی پۆشاکەکە خۆیەوە: وەك مێزەر یان کراس یا هەر پۆشاکێکی تر، لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ منت پۆشتە کردەوە، داوای خێر و چاکەی ئەم پۆشاکەت لێ دەکەم، وە

داوای ئەو خێر و چاكەیەت لێ دەكەم كە بۆی دروست كراوە، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەمەو ئەو خراپەیەی كە بۆی دروست كراوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی جبە و هەردوو خوفەكە

٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الجُبَّةِ وَالخُفَّيْنِ

١٧٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَبِسَ جُبَّةً رُومِيَّةً ضَيِّقَةَ الكُمَّيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عوروەی كوڕی موغیرەی كوڕی شوعبەوە، لە باوكیەوە، ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جبەیەكی ڕۆمی لەبەر دەكرد قۆڵی جبەكەی تەسك بوو.

١٧٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ هُوَ الشَّيْبَانِيُّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: أَهْدَى دِحْيَةُ الكَلْبِيُّ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُفَّيْنِ فَلَبِسَهُمَا: وقَالَ إِسْرَائِيلُ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عَامِرٍ: وَجُبَّةً فَلَبِسَهُمَا حَتَّى تَخَرَّقَا، لاَ يَدْرِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذَكِيٌّ هُمَا أَمْ لاَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَأَبُو إِسْحَاقَ: اسْمُهُ سُلَيْمَانُ، وَالحَسَنُ بْنُ عَيَّاشٍ هُوَ أَخُو أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ.

واتە: لە شەعبیەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: موغیرەی كوڕی شوعبەوە فەرمووی: دیحیەی كەلبی جوتێ خوفی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەویش لەپێی كرد. لە عامیرەوە هاتووە، كە جبەیەكی بۆ نارد لەبەری كرد هەتا دڕا لەبەریدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەیزانی خوفەكان لە

پێستی ئاژەڵی سەربڕاو بوون یان نا واتە یا لە پێستی ئاژەڵی مردارەوە بوو بوون.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی توندکردنی ددان بە زێڕ

٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَدِّ الأَسْنَانِ بِالذَّهَبِ

١٧٧٠ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ هَاشِمِ بْنِ البَرِيدِ، وَأَبُو سَعْدٍ الصَّاغَانِيُّ، عَنْ أَبِي الأَشْهَبِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ طَرَفَةَ، عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ أَسْعَدَ قَالَ: أُصِيبَ أَنْفِي يَوْمَ الكُلاَبِ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَاتَّخَذْتُ أَنْفًا مِنْ وَرِقٍ، فَأَنْتَنَ عَلَيَّ فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَتَّخِذَ أَنْفًا مِنْ ذَهَبٍ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الرَّبِيعُ بْنُ بَدْرٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الوَاسِطِيُّ، عَنْ أَبِي الأَشْهَبِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ طَرَفَةَ وَقَدْ رَوَى سَلْمُ بْنُ زَرِيرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ طَرَفَةَ نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي الأَشْهَبِ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُمْ شَدُّوا أَسْنَانَهُمْ بِالذَّهَبِ، وَفِي هَذَا الحَدِيثِ حُجَّةٌ لَهُمْ. وقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ: سَلْمُ بْنُ رَزِينٍ وَهُوَ وَهْمٌ وَزَرِيرٌ أَصَحُّ وَأَبُو سَعْدٍ الصَّاغَانِيُّ: اسْمُهُ مُحَمَّدُ بْنُ مُيَسَّرٍ.

واتە: لە عەرفەجەی کوڕی ئەسعەدەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە سەردەمی نەفامیدا لەرۆژی جەنگی (کولاب)دا لوتم بڕا، لوتێکم لە زیو بۆ خۆم دروستکرد، بۆگەنی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردم لوتێك لە زێڕ دروست بکەم. لە هەندێ لە زانایانەوە دەگێڕنەوە، کە ئەوان واتە هاوەڵان ددانیان بە زێڕ توند دەکردەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی پێستی دڕندە

## ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ

١٧٧٠م- (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ أَنْ تُفْتَرَشَ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ أَنَّهُ كَرِهَ جُلُودَ السِّبَاعِ. وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا قَالَ عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، غَيْرَ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی کەوڵی دڕندە رابخرێت و لەسەری دانیشن.

١٧٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ نَهَى عَنْ جُلُودِ السِّبَاعِ وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە بەکارهێنانی کەوڵی دڕندە.

## دەربارەی نەعلەكانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نَعْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

١٧٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: كَيْفَ كَانَ نَعْلُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: لَهُمَا قِبَالاَنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: وتم بە ئەنەسی كوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ: نەعلەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن بوو؟ فەرمووی: دوو زوێڵ قایشیان پێوە بوو. - پارچەیەكیان سەرێكی بەند كرابوو بە سەربەنی نەعلەكەوەو سۆڵەكەوەو ئەو سەرەكەی تری بە لوتی نەعلەكەوە دەكەوتە نێوان پەنجە كەڵەو پەنجەكەی تەنیشتیەوە، پارچەكەی تریشیان هەروەها بوو، بەڵام دەكەوتە نێوان پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی براتوتەوە -.

١٧٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ نَعْلاَهُ لَهُمَا قِبَالاَنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە نەعلەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو زوێڵ قایشیان پێوە بوو.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆشتن بە نەعلێکەوە دروست نیە**

٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْمَشْيِ فِي النَّعْلِ الوَاحِدَةِ

١٧٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ (ح) وحَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا، أَوْ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعًا.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسیّ لە ئێوە بە تاکە پێلاوێکەوە ریّ نەکات، یان هەردوو تاکەکەی لەپیّ بکات، یا هەردووکیان داکەنیّ و بەپێی پەتی ریّ بکات).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی بە پێوە پێلاو لەپیّ کردن باش نیە**

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ وَهُوَ قَائِمٌ

١٧٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ مَرْوَانَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَارِثُ بْنُ نَبْهَانَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ وَهُوَ قَائِمٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَى عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ وَكِلاَ الحَدِيثَيْنِ لاَ يَصِحُّ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ، وَالحَارِثُ بْنُ نَبْهَانَ لَيْسَ عِنْدَهُمْ بِالحَافِظِ، وَلاَ نَعْرِفُ لِحَدِيثِ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ أَصْلاً.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەوەی پیاو بە پێوە پێلاو لەپیّ بکات.

١٧٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ السِّمْنَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ الرَّقِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ وَهُوَ قَائِمٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: وَلاَ يَصِحُّ هَذَا الحَدِيثُ، وَلاَ حَدِيثُ مَعْمَرٍ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی كردوە لەوەی پیاو بە پێوە پێڵاو لەپێ بكات.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەتی بە تاكە پێڵاویكەوە ڕێ كردن

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي الْمَشْيِ فِي النَّعْلِ الوَاحِدَةِ

١٧٧٧ - (منكر) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ السَّلُولِيُّ كُوفِيٌّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُرَيْمُ بْنُ سُفْيَانَ البَجَلِيُّ الكُوفِيُّ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رُبَّمَا مَشَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تاكە نەعلێكەوە ڕێی دەكرد.

١٧٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا مَشَتْ بِنَعْلٍ وَاحِدَةٍ، وَهَذَا أَصَحُّ. وَهَكَذَا رَوَاهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ مَوْقُوفًا وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بێگومان جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە تاکە نەعلێکەوە ڕێی دەکرد.

## دەربارەی پیاو سەرەتا کام تاك لەپێ بکات

## ٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ بِأَيِّ رِجْلٍ يَبْدَأُ إِذَا انْتَعَلَ

١٧٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ (ح) وحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، فَلْتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ، وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە ویستی پێڵاوەکانی لەپێ بکات با لەلای ڕاستیەوە دەست پێ بکات واتە یەکەم جار تاکی ڕاستی پێڵاوەکە لەپێ بکات، لەکاتی داکەندنیشدا با لەلای چەپیەوە دەست پێ بکات واتە یەکەم جار تاکی پێی چەپی لەپێ دانێ، وە با پێی ڕاستی یەکەم بێ لەکاتی لەپێ کردندا، دواهەم بێ لەکاتی داناندا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پینەکردنی پۆشاك

## ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْقِيعِ الثَّوْبِ

١٧٨٠ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْوَرَّاقُ، وَأَبُو يَحْيَى الْحِمَّانِيُّ قَالاَ: حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ حَسَّانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَدْتِ اللُّحُوقَ بِي فَلْيَكْفِكِ مِنَ

الدُّنْيَا كَزَادِ الرَّاكِبِ، وَإِيَّاكِ وَمُجَالَسَةَ الأَغْنِيَاءِ، وَلاَ تَسْتَخْلِقِي ثَوْبًا حَتَّى تُرَقِّعِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ صَالِحِ بْنِ حَسَّانَ وَسَمِعْتُ مُحَمَّدًا يَقُولُ: صَالِحُ بْنُ حَسَّانَ مُنْكَرُ الحَدِيثِ، وَصَالِحُ بْنُ أَبِي حَسَّانَ الَّذِي رَوَى عَنْهُ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ ثِقَةٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: وَإِيَّاكِ وَمُجَالَسَةَ الأَغْنِيَاءِ، عَلَى نَحْوِ مَا رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ رَأَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الخَلْقِ وَالرِّزْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ مِمَّنْ فُضِّلَ هُوَ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ لاَ يَزْدَرِيَ نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْهِ. وَيُرْوَى عَنْ عَوْنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: صَحِبْتُ الأَغْنِيَاءَ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا أَكْثَرَ هَمًّا مِنِّي، أَرَى دَابَّةً خَيْرًا مِنْ دَابَّتِي، وَثَوْبًا خَيْرًا مِنْ ثَوْبِي، وَصَحِبْتُ الْفُقَرَاءَ فَاسْتَرَحْتُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر دەتەوێ بگەی بە پلەی من لە بەهەشتدا بەکەم رازی ببە لە دونیادا هێندەی توێشوی سوارێك، خۆت بەدوور بگرە لەدانیشتن لەگەڵ دەوڵەمەندەکان، پۆشاك بە کۆن دامەنێ هەتا دەدرێ و پینەی دەکەیت و لەبەری دەکەیتەوە).

مانای: (خۆت بەدوور بگرە لەدانیشتن لەگەڵ دەوڵەمەندەکان). هاوشێوەی ئەم فەرمایشتەیە کە لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان یەکێکی دی خوای گەورە فەزڵی دابوو بەسەریدا لە جوانی و رۆزی و ماڵ و سامانی دونیایدا، با تەماشای حاڵی خوارتری خۆی بکات، چونکە ئەگەر وا نەکەن لەوانەیە ئەو نازو بەهرانەی کە خودا پێی داون بەکەمی بزانن و تووشی ناسوپاسگوزاری ببن).

لە عەونی کوری (عبد الله)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (هاوڕێیەتی دەوڵەمەندەکانم کرد لەو کاتەدا هیچ کەسێکم نەدەدی هێندەی من هەم و غەمی دونیای هەبێ، دیم وڵاخەکەی لە وڵاخەکەی من چاکترە، پۆشاکەکەی لە

عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ شەرەف و ناموس و ئابڕووی برا موسوڵمانەکەی بپارێزێ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوومەتی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دەنگ وەرگرتن لە برای موسوڵمان

٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الهَجْرِ لِلْمُسْلِمِ

١٩٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ (ح) وَحَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيَصُدُّ هَذَا وَيَصُدُّ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَهِشَامِ بْنِ عَامِرٍ، وَأَبِي هِنْدٍ الدَّارِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەکات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر، بەشێوەیە کاتێ کە بگەن بە یەك هەریەکەیان ڕوو بکات بە لایەکداو پشت لەیەکتر هەڵکەن، چاکترینیان ئەو کەسەیانە لەپێشەوە سەلام لەوی تریان دەکات).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی کردن بە برا بەش**

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُوَاسَاةِ الأَخِ

١٩٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ الْمَدِينَةَ آخَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، فَقَالَ لَهُ: هَلُمَّ أُقَاسِمْكَ مَالِي نِصْفَيْنِ، وَلِيَ امْرَأَتَانِ فَأُطَلِّقُ إِحْدَاهُمَا، فَإِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا فَتَزَوَّجْهَا، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، دُلُّونِي عَلَى السُّوقِ، فَدَلُّوهُ عَلَى السُّوقِ، فَمَا رَجَعَ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ وَمَعَهُ شَيْءٌ مِنْ أَقِطٍ وَسَمْنٍ قَدْ اسْتَفْضَلَهُ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ وَعَلَيْهِ وَضَرٌ مِنْ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: مَهْيَمْ؟ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ قَالَ: فَمَا أَصْدَقْتَهَا؟ قَالَ: نَوَاةً، قَالَ حُمَيْدٌ أَوْ قَالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: وَزْنُ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ وَزْنُ ثَلاَثَةِ دَرَاهِمَ وَثُلُثٍ. وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: وَزْنُ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، وَزْنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ سَمِعْتُ إِسْحَاقَ بْنَ مَنْصُورٍ، يَذْكُرُ عَنْهُمَا هَذَا.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: کاتێ (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عــەوف گەیشــتە مــەدینــە، پێغەمبــەری خوا صلى الله عليه وسلم لەگەڵ سەعدی کوڕی ڕەبیع کردنی بە بــرای یــەك، ســەعد فەرمووی: وەرە با ماڵ و سامەنەکەم دابەش بکەین نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بــۆ خــۆم، دوو ژنم هەیە، یەکێکیان تەڵاق دەدەم کاتێ کە عیددەی تەواو بوو مــارەی بکــە بــۆ خۆت، فەرمووی: خوا بەرەکەت بخاتە خانەوادە و ماڵ و سامەنەکەتەوە تــۆ ڕێگــەی بــازاڕم نیشــان بــدە، ڕێگــەی بــازاڕی نیشــان دا، لــە بــازاڕ نەدەگەڕایــەوە بــە ڕۆن و پەنیرەوە نەبوایە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر قازانجی دەکرد، ڕۆژێ پێغەمبەری خــوا صــلى الله عليــە وســلم (عَبْــدُ الــرَّحْمَن)ی شــوێنەواری زەعفــەرانی پێــوە دیــار بــوو زەرد

هەڵگەڕابوو، فەرمووی: (ئەحواڵت چۆنە ئەمە چیە بۆ وات لیٚ هاتوە؟). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ژنێکی ئەنصاریم مارەبڕیوە بۆ خۆم، فەرمووی: (چیت کردۆتە مارەیی؟). وتی: لەسەر پارچە زێڕێك، فەرمووی: (داوەتی شایی بکە هەرچەندە بە مەڕیٚ یان بە بزنێکیش بێت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی غەیبەت

٢٣ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الغِيبَةِ

١٩٣٤ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الغِيبَةُ؟ قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ بَهَتَّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم غەیبەت چیە؟ فەرمووی: (ئەوەیە لەپاش ملە باسی برا موسوڵمانەکەت بکەی پێی ناخۆش بیٚ). وتی: ئەی ئەگەر ئەوەی دەیڵێم لە براکەمدا هەبوو هەر غەیبەتە؟ فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی تێدا بوو ئەوە غەیبەتی دەکەی، خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو ئەوە درۆ و بوختانی بۆ دەکەی).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیرەیی

٢٤ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَسَدِ

١٩٣٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ العَلاَءِ العَطَّارُ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

لاَ تَقَاطَعُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَحَاسَدُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەیوەندی لەگەڵ یەك مەپچڕێنن، پشت لە یەکتر مەکەن، یەکتر مەبوخزێنن و رقتان لەیەکتر نەبێ، ئیرەیی بە یەکتر مەبەن — ئاواتەخواز مەبن نیعمەتەکانی برا موسوڵمانەکەتان لەناوبچێ - ، بەندەی خوا و برای یەکتر بن، بۆ هیچ موسوڵمانێ ڕەوا نیە دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ و قسەی لەگەڵ نەکات لەسێ شەو و ڕۆژ زیاتر).

١٩٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهُوَ يُنْفِقُ مِنْهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوُ هَذَا.

واتە: لە سالمەوە، لەباوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیرەیی بە یەکتر بردن دروست نیە لەم دوو حاڵەتەدا نەبێ: پیاوێ خوا ماڵ و سامانێکی زۆری پێ ببەخشێ ئەویش شەو ڕۆژ خەریکی بەخشینی بێ لەڕێی خوا، پیاوێکی قورئان خوێن شەو ڕۆژ هەر خەریکی قورئان خوێندن بێ و دەوری بکاتەوە).

## دەربارەی یەكتر بوغزاندن و رق لەیەكتر بوون

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّبَاغُضِ

١٩٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ يَئِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَأَبُو سُفْيَانَ اسْمُهُ طَلْحَةُ بْنُ نَافِعٍ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّرنەوە، كە فەرموویەتی: پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەیتان بیّ ئومیّد و مەئیوس بووە لەوەی كە نویّژخویّنان واتە باوەڕداران بیپەرستن، بەڵام هەوڵ دەدات دووبەرەكی و ئاژاوە و ناكۆكی بخاتە نیّوانیانەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاشتەوایی

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِصْلَاحِ ذَاتِ البَيْنِ

١٩٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أُمِّهِ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَيْسَ بِالكَاذِبِ مَنْ أَصْلَحَ بَيْنَ النَّاسِ فَقَالَ خَيْرًا أَوْ نَمَى خَيْرًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (أُمِّ كُلْثُومٍ)ی كچی عوقبەوە دەگیّرنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەو كەسە بە درۆزن لەقەڵەم نادریّت ئاشتەوایی و چاكسازی بكات لەنیّوان خەڵكدا قسەیە بكات بە مەبەستی خیّر و چاكەو ئاشتەوایی یان قسەی چاك بهیّنیّ و ببات).

١٩٣٩ - (صحيح دون قوله: (لِيُرْضِيَهَا) ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ (ح) وَحَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ السَّرِيِّ، وَأَبُو أَحْمَدَ قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَحِلُّ الكَذِبُ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ: يُحَدِّثُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ لِيُرْضِيَهَا، وَالكَذِبُ فِي الحَرْبِ، وَالكَذِبُ لِيُصْلِحَ بَيْنَ النَّاسِ وَقَالَ مَحْمُودٌ فِي حَدِيثِهِ: لاَ يَصْلُحُ الكَذِبُ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ أَسْمَاءَ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ خُثَيْمٍ. وَرَوَى دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَسْمَاءَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ دَاوُدَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ.

**واتە: لە ئەسمای کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (درۆکردن ڕەوا نییە لەم سێ حاڵەتەدا نەبێ: پیاوێ درۆبکات بۆ ڕەزامەندی هاوسەرەکەی، درۆکردن لە جەنگدا، درۆکردن بۆ ئاشتەوایی لەنێوان خەڵکدا).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی غەش و ناپاکی

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخِيَانَةِ وَالغِشِّ

١٩٤٠ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ لُؤْلُؤَةَ، عَنْ أَبِي صِرْمَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ ضَارَّ ضَارَّ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ شَاقَّ شَقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

**واتە: لە ئەبو (صِرْمَة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا**

صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ زیان بگەیەنێ بە — جەستە و ماڵ و سامانی - کەسێکی تر خوای گەورە زیانی گەورەتری پێ دەگەیەنێ، وە هەرکەسێ باری شانی کەسێ قورس و گران بکات خوای گەورە باری شانی ئەو قورس و گرانتر دەکات).

١٩٤١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الحُبَابِ العُكْلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا فَرْقَدُ السَّبَخِيُّ، عَنْ مُرَّةَ بْنِ شَرَاحِيلَ الهَمْدَانِيِّ وَهُوَ الطَّيِّبُ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَلْعُونٌ مَنْ ضَارَّ مُؤْمِنًا أَوْ مَكَرَ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نەفرەتی کەسێکە زیان دەگەیەنێ بە باوەڕدار یان فێڵی لێ دەکات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مافی دراوسێ

## ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ الجِوَارِ

١٩٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ هُوَ ابْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جبریل ئەوەندە ئامۆژگاری کردم لەبارەی دراوسێوە، هەتا وام دەزانی دراوسێ لە دراوسێ میرات دەگرێ).

١٩٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ شَابُورَ، وَبَشِيرٍ أَبِي إِسْمَاعِيلَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ذُبِحَتْ لَهُ شَاةٌ فِي أَهْلِهِ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: أَهْدَيْتُمْ لِجَارِنَا اليَهُودِيِّ؟ أَهْدَيْتُمْ لِجَارِنَا اليَهُودِيِّ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَالمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَبِي شُرَيْحٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيْضًا.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، كە (عبد الله)ی كوڕی عەمر مەڕێكی سەربڕی بۆ خانەوادەكەی، كاتێ كە هات فەرمووی: گۆشتان برد بۆ دراوسێ جوولەكەكەم؟ گۆشتان برد بۆ دراوسێ جوولەكەكەم؟ بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (جبریل ئەوەندە ئامۆژگاری كردم لەبارەی دراوسێوە، هەتا وام دەزانی دراوسێ لە دراوسێ میرات دەگرێ).

١٩٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ شُرَحْبِيلَ بْنِ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الجِيرَانِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَأَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيُّ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاكترین هاوڕێ كە پاداشتی زۆرتربێ لای خوای گەورە چاكترین كەسە بۆ هاوڕێكەی، وە چاكترین دراوسێ كە پاداشتی زۆرتربێ لای خوای گەورە چاكترین كەسە بۆ دراوسێكەی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاكە لەگەڵ خزمەتكار

٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِحْسَانِ إِلَى الخَدَمِ

١٩٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ فِتْيَةً تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِنْ طَعَامِهِ، وَلْيُلْبِسْهُ مِنْ لِبَاسِهِ، وَلاَ يُكَلِّفْهُ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (أبي ذر)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەم خزمەتكارانە براتانن خوای گەورە كردوونی بە ژێردەستەی ئێوە، جا ئەگەر كەسێ لەئێوە خزمەتكارێكی هەبوو با لە خواردن و پۆشاكدا خۆی لێ جیا نەكاتەوە لەوەی خۆی دەیخوات بەشی ئەویشی لێ بدات، چ پۆشاكێ لەبەردەكات لەو پۆشاكەش بۆ ئەو بكات، كاری قورس و گرانی پێ نەكات لە تواناییدا نەبێ، خۆ ئەگەر چاری نەبوو كاری قورسی دا بەسەریدا با یارمەتی بدات).

١٩٤٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ يَحْيَى، عَنْ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، عَنْ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ سَيِّئُ الْمَلَكَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ تَكَلَّمَ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ وَغَيْرُ وَاحِدٍ فِي فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەكرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی ڕەوشتی خراپ

بێ بەرامبەر بە خزمەتکارەکەی ناچێتە بەهەشتەوە).

## دەربارەی قەدەغەکردنی جنێودان بە خزمەتکار و لێدانی

### ٣٠ - بَابُ النَّهْيِ عَنْ ضَرْبِ الخَدَمِ وَشَتْمِهِمْ

١٩٤٧ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ غَزْوَانَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو القَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيُّ التَّوْبَةِ: مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بَرِيئًا مِمَّا قَالَ لَهُ، أَقَامَ اللَّهُ عَلَيْهِ الحَدَّ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَابْنُ أَبِي نُعْمٍ هُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي نُعْمٍ البَجَلِيُّ، يُكْنَى أَبَا الحَكَمِ. وَفِي البَابِ عَنْ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کەسێ بوختان بکات بۆ بەندەی خۆی واتە تاوانباری بکات بەوەی کە زینای کردووە لەکاتێکدا بەندەکە بێ تاوان بێ، ئەوە ئەو کەسە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە داری حەدی لێ دەدات).

١٩٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: كُنْتُ أَضْرِبُ مَمْلُوكًا لِي، فَسَمِعْتُ قَائِلاً مِنْ خَلْفِي يَقُولُ: اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ، اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ، فَالتَفَتُّ، فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: فَمَا ضَرَبْتُ مَمْلُوكًا لِي بَعْدَ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَإِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ هُوَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَزِيدَ بْنِ شَرِيكٍ.

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بەندەیەکم هەبوو جارێ لێم دا، گوێم لێ بوو یەکێ لەدوامەوە

دەیفەرموو: (بزانە ئەی ئەبا مەسعود، بزانە ئەی ئەبا مەسعود)، ئاوڕمدایەوە سەیر دەكەم پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (تۆ چەندە دەسەڵاتت هەیە بەسەر ئەو بەندەیەدا خوای گەورە زیاتر دەسەڵاتی هەیە بەسەر تۆدا). ئەبو مەسعود فەرمووی: لەدوای ئەوە هەرگیز لە بەندەی خۆم نەدا.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی لێبوردن لە خزمەتكار

٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَفْوِ عَنِ الخَادِمِ

١٩٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي هَانِئٍ الخَوْلاَنِيِّ، عَنْ عَبَّاسٍ الحَجْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَمْ أَعْفُو عَنِ الْخَادِمِ؟ فَصَمَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَمْ أَعْفُو عَنِ الخَادِمِ؟ فَقَالَ: كُلَّ يَوْمٍ سَبْعِينَ مَرَّةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَرَوَاهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ أَبِي هَانِئٍ الخَوْلاَنِيِّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوًا مِنْ هَذَا، وَالعَبَّاسُ هُوَ ابْنُ جُلَيْدٍ الحَجْرِيُّ الْمِصْرِيُّ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ أَبِي هَانِئٍ الخَوْلاَنِيِّ بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَهْبٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ، وَقَالَ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! ڕۆژی چەند جار لە خزمەتكار ببورین؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بێ دەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە، لەپاشدا پیاوەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! ڕۆژی چەند جار لە خزمەتكار ببورین؟ فەرمووی: (هەموو ڕۆژێ حەفتا جار لێی ببورە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەدەبدانی خزمەتکار

### ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَدَبِ الْخَادِمِ

١٩٥٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي هَارُونَ العَبْدِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ فَارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ. وَأَبُو هَارُونَ العَبْدِيُّ اسْمُهُ عُمَارَةُ بْنُ جُوَيْنٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ العَطَّارُ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: ضَعَّفَ شُعْبَةُ أَبَا هَارُونَ العَبْدِيَّ قَالَ يَحْيَى: وَمَا زَالَ ابْنُ عَوْنٍ يَرْوِي عَنْ أَبِي هَارُونَ حَتَّى مَاتَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە دای لە خزمەتکارەکەی، خزمەتکارەکەی پاڕایەوە و ناوی خوای هێنا دەستی لێ هەڵگرن و لێی مەدەن). — وەك ئەوەی هاوار بکات و بڵێ بۆ خاتری خوا لێم مەدە -.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەدەبدانی منداڵ

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَدَبِ الوَلَدِ

١٩٥١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَعْلَى، عَنْ نَاصِحٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَنَاصِحٌ هُوَ ابْنُ العَلاَءِ كُوفِيٌّ لَيْسَ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ بِالقَوِيِّ وَلاَ يُعْرَفُ هَذَا الحَدِيثُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَنَاصِحٌ شَيْخٌ آخَرُ بَصْرِيٌّ، يَرْوِي عَنْ عَمَّارِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ وَغَيْرِهِ وَهُوَ أَثْبَتُ مِنْ هَذَا.

واتـە: لـە جـابیری کـوڕی سـەمورەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (ئەگـەر پیـاو ئەدەبی منداڵەکەی دابدات چاکترە لەوەی بە مەن(صاع) ببەخشێ لەڕێی خوا).

١٩٥٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَامِرُ بْنُ أَبِي عَامِرٍ الخَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدًا مِنْ نَحْلٍ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَامِرِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ الخَزَّازِ وَهُوَ عَامِرُ بْنُ صَالِحِ بْنِ رُسْتُمَ الخَزَّازُ وَأَيُّوبُ بْنُ مُوسَى هُوَ ابْنُ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ وَهَذَا عِنْدِي حَدِيثٌ مُرْسَلٌ.

واتە: لە ئەیوبی کوڕی موساوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لـێ بـێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (بـاوك هـیچ شتێکی نەبەخشیوە بە منداڵەکەی چاکتر بێ لە ئەدەب و ڕەوشتی جوان).

## دەربارەی وەرگرتنی دیاری و پاداشت دانەوە لەسەری

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَبُولِ الهَدِيَّةِ وَالمكَافَأَةِ عَلَيْهَا

١٩٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَكْثَمَ، وَعَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْبَلُ الهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِيسَى بْنِ يُونُسَ عَنْ هِشَامٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەر صـلی الله علیە وسلم دیاری وەردەگرت و پاداشتی کەسەکەی دەدایەوە.

## دەربارەی سوپاسكردنی كەسیێ چاك بێ بۆت

## ٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّكْرِ لِمَنْ أَحْسَنَ إِلَيْكَ

١٩٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الرَّبِيعُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ لاَ يَشْكُرُ اللَّهَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی سوپاسی خەڵك نەكات سوپاس و ستایشی خوای گەورەش ناكات).

١٩٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى (ح) وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الرُّؤَاسِيُّ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ.وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَالأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی سوپاسی خەڵك نەكات سوپاس و ستایشی خوای گەورەش ناكات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاكەكردن

## ٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَنَائِعِ الْمَعْرُوفِ

١٩٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ العَظِيمِ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ الجُرَشِيُّ اليَمَامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُمَيْلٍ، عَنْ

مَالِكِ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالمعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلاَلِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ الرَّدِيءِ البَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الحَجَرَ وَالشَّوْكَةَ وَالعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَأَبُو زُمَيْلٍ اسْمُهُ سِمَاكُ بْنُ الوَلِيدِ الحَنَفِيُّ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێکەنین بە ڕووی براکەتەوە خێر و چاکەیە بۆت، فەرمانکردنت بە چاکە خێر و چاکەیە بۆت، ڕێگری کردنت لەخراپە خێر و چاکەیە بۆت، ڕێ نیشان بدەی بە کەسێکی ڕێ لێ تێك چوو خێر و چاکەیە بۆت، یارمەتی کوێرێك بدەی خێر و چاکەیە بۆت، بەردێ یان دڕکێ یا ئێسکێ لەسەر ڕێگا لابەی خێر و چاکەیە بۆت، لەدۆڵچەکەی خۆت ئاو بکەیتە دۆڵچەی براکەتەوە خێر و چاکەیە بۆت).

## ئاژەڵی شیردەر ببەخشرێ بە ماڵە هەژارێ لەشیرەکەی بخۆن

### ٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمِنْحَةِ

١٩٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يُوسُفَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْسَجَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ البَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ مَنَحَ مَنِيحَةَ لَبَنٍ أَوْ وَرِقٍ أَوْ هَدَى زُقَاقًا كَانَ لَهُ مِثْلَ عِتْقِ رَقَبَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، لاَ

نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ رَوَى مَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ، وَشُعْبَةُ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ هَذَا الحَدِيثَ. وَفِي البَابِ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ وَمَعْنَى قَوْلِهِ: مَنْ مَنَحَ مَنِيحَةَ وَرِقٍ إِنَّمَا يَعْنِي بِهِ: قَرْضَ الدَّرَاهِمِ، قَوْلُهُ: أَوْ هَدَى زُقَاقًا: يَعْنِي بِهِ هِدَايَةَ الطَّرِيقِ وَهُوَ إِرْشَادُ السَّبِيلِ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (کەسێ ئاژەڵێکی شیردەر ببەخشێ بە ماڵە هەژارێ یان پارە بدات بە قەرز یا ڕێگەیە نیشان بدات بە کەسێکی نەشارەزا وەك ئەوە وایە کۆیلەیە ڕزگار بکات).

## لابردنی شتێ لەسەر ڕێگایەکدا ئازاری خەڵك بدات

## ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِمَاطَةِ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ

١٩٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي طَرِيقٍ إِذْ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي ذَرٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جارێ پیاوێ بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت درەختێکی دڕکاوی لەسەر ڕێگایەکدا بینی لایبرد و دووری خستەوە لە ڕێگاکە سوپاسی خوای کرد خوا لێی خۆش بوو).

## دەربارەی قسەی ناو كۆڕ و دانیشتن ئەمانەتە

### ٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمَجَالِسَ أَمَانَةٌ

١٩٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ الحَدِيثَ ثُمَّ التَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَإِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ لەكاتی قسەكردندا ئاوڕی دایەوە بەملاو بەو لادا هەتا بزانێ كەس گوێی لە قسەكەیەتی یان نا ئەوە قسەكەی ئەمانەت و سپاردەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشندەیی

### ٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّخَاءِ

١٩٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ لَيْسَ لِي مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ أَفَأُعْطِي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلاَ تُوكِي فَيُوكَى عَلَيْكِ يَقُولُ: لاَ تُحْصِي فَيُحْصَى عَلَيْكِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ بِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا، عَنْ أَيُّوبَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ.

واتە: لە ئەسمائی كچی ئەبو بەكرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە

فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! من هیچ شتێکم نیە ببەخشم جگە لە ماڵ و سامانی زوبێری هاوسەرم ئایا ئەتوانم لێی ببەخشم؟ فەرمووی: (لێی ببەخشە و خێر بکە مەیکەرە کیسەو تورەکەوەو دەمەکەی توند مەبەستەو لە هەژارانی مەگرەرەوە، ئەگینا خوای گەورە لەتۆشی دەگرێتەوە).

١٩٦١ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الوَرَّاقُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: السَّخِيُّ قَرِيبٌ مِنَ اللهِ قَرِيبٌ مِنَ الجَنَّةِ قَرِيبٌ مِنَ النَّاسِ بَعِيدٌ مِنَ النَّارِ، وَالبَخِيلُ بَعِيدٌ مِنَ اللهِ بَعِيدٌ مِنَ الجَنَّةِ بَعِيدٌ مِنَ النَّاسِ قَرِيبٌ مِنَ النَّارِ، وَالْجَاهِلُ السَّخِيُّ أَحَبُّ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ عَابِدٍ بَخِيلٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَقَدْ خُولِفَ سَعِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ فِي رِوَايَةِ هَذَا الحَدِيثِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، إِنَّمَا يُرْوَى عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَائِشَةَ شَيْءٌ مُرْسَلٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مرۆڤی بەخشندە نزیکە لەبەزەیی خواوە، لە بەهەشتەوە نزیکە بەو چاکەیەی کە دەیکات، لەخەڵکەوە نزیکە چونکە خەڵك خۆشیان دەوێ، لە ئاگر بەدوورە، مرۆڤی دەست قوچاو و رژدی و چروکی دوورە لەبەزەیی خواوە، لەخەڵکەوە دوورە چونکە خەڵك خۆشیان ناوێ، نزیکە لە ئاگرەوە، مرۆڤی نەزان و بەخشندە لای خوای گەورە خۆشەویستترە لە خواپەرستێکی چروك).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رژدی و چروكی

### ٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي البَخِيلِ

١٩٦٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ غَالِبٍ الحُدَّانِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَصْلَتَانِ لاَ تَجْتَمِعَانِ فِي مُؤْمِنٍ: البُخْلُ وَسُوءُ الخُلُقِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ صَدَقَةَ بْنِ مُوسَى. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دوو شت لە مرۆڤی باوەڕداردا كۆنابنەوە: رژدی و چروكی و بەدڕەوشتی).

١٩٦٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ مُوسَى، عَنْ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، عَنْ مُرَّةَ الطَّيِّبِ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ خِبٌّ وَلاَ مَنَّانٌ وَلاَ بَخِيلٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەكرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەمانە ناچنە بەهەشتەوە: كەسێ فروفێڵ بكات بۆ تێكدانی نێوانی خەڵك، كەسێ ببەخشێ بە كەسێكی هەژار لەپاشدا منەت بكا بەسەریدا، هەروەها مرۆڤی رژد و چروك).

١٩٦٤ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ بِشْرِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُؤْمِنُ غِرٌّ كَرِيمٌ، وَالفَاجِرُ خِبٌّ لَئِيمٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باوەڕدار دڵ ساف و سادەو بەرێز و بەخشندەیە، خراپەکاریش ئاژاوەگێڕ و فێڵباز و خوێڕی و نارەسەنە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشین بە خانەوادە و کەسوکار

## ٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّفَقَةِ عَلَى الأَهْلِ

١٩٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نَفَقَةُ الرَّجُلِ عَلَى أَهْلِهِ صَدَقَةٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەخشین بە خانەوادە و کەسوکار خێر و چاکەیە).

١٩٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَفْضَلُ الدِّينَارِ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَ أَبُو قِلَابَةَ: بَدَأَ بِالعِيَالِ، ثُمَّ قَالَ: فَأَيُّ رَجُلٍ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ رَجُلٍ يُنْفِقُ عَلَى عِيَالٍ لَهُ صِغَارٍ يُعِفُّهُمُ اللَّهُ بِهِ وَيُغْنِيهِمُ اللَّهُ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین دینار ئەو دینارەیە کە پیاو دەیبەخشی بە

ماڵ و منداڵ و خانەوادەکەی، وە ئەو دینارەیە کە دەیبەخشێ بەو ئەسپەی کە ئامادەکراوە بۆ جیهاد و تێکۆشان لەڕێی خوا، هەروەها ئەو دینارەیە کە دەیبەخشێ بە تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا (موجاهیدین). ئەبو قیلابە فەرمووی: سەرەتا لە ماڵ و منداڵ و خانەوادەوە دەستی پێ کرد. لەپاشدا فەرمووی: (چ پیاوێ پاداشتی گەورەترە لەو پیاوەی کە دەبەخشێ بە ماڵ و منداڵ و خانەوادەکەی و منداڵی بچوکی خۆی بە خێو دەکات، خوای گەورەش بەهۆی ئەوەوە دووریان دەخاتەوە لەخراپە و دەوڵەمەند و بێ ئیحتیاجیان دەکات).

### ئەوەی هاتووە سەبارەت بە میوانداری کە چەند ڕۆژە

### ٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الضِّيَافَةِ كَمْ هِيَ

١٩٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ العَدَوِيِّ أَنَّهُ قَالَ: أَبْصَرَتْ عَيْنَايَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَمِعَتْهُ أُذُنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جَائِزَتَهُ قَالُوا: وَمَا جَائِزَتُهُ؟ قَالَ: يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، وَمَا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو شورەیحی عەدەویەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: چاوم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، بە گوێی خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێ باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قەدر و ڕێزی میوانی خۆی بگرێ و خەڵاتی بکات، خەڵاتەکەی شەو و ڕۆژێکە، میوانداری سێ ڕۆژە، لەپاش ئەوە خێر و چاکەیە، ڕەوا نی یە بۆی ئەوەندە بمێنێتەوە خاوەن ماڵ سەغڵەت بکات و گوناهباری بکات - واتە ئەوەندە نەمێنێتەوە خاوەن ماڵ توانای ڕێز لێ گرتنی نەمێنێ و هیچی نەمێنێ دەرخواردی بدات - ، هەرکەسێ باوەڕی بە خواو بە

رۆژی دوایی هەیە با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێ و قسە نەکات).

١٩٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الكَعْبِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، وَجَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَمَا أُنْفِقَ عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ وَقَدْ رَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَاللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو شُرَيْحٍ الخُزَاعِيُّ هُوَ الكَعْبِيُّ وَهُوَ العَدَوِيُّ اسْمُهُ خُوَيْلِدُ بْنُ عَمْرٍو وَمَعْنَى قَوْلِهِ: لاَ يَثْوِي عِنْدَهُ يَعْنِي: الضَّيْفَ لاَ يُقِيمُ عِنْدَهُ حَتَّى يَشْتَدَّ عَلَى صَاحِبِ الْمَنْزِلِ، وَالحَرَجُ هُوَ الضِّيقُ، إِنَّمَا قَوْلُهُ: حَتَّى يُحْرِجَهُ يَقُولُ: حَتَّى يُضَيِّقَ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو شورەیحی کەعبییەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چاوم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، بە گوێی خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (میوانداری سێ شەو و ڕۆژە، خەڵاتەکەی شەو و ڕۆژێکە، لەپاش ئەوە خێر و چاکەیە بۆ خاوەن ماڵ، ڕەوا نی یە بۆی ئەوەندە بمێنێتەوە خاوەن ماڵ سەغڵەت و گوناهبار بکات).

## دەربارەی تێکۆشان لەپێناوی بێوەژن و هەتیودا

٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّعْيِ عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْيَتِيمِ

١٩٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِينِ كَالمجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوْ كَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ.

واتە: لە صەفوای کوڕی سولەیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ تێبکۆشێ لەپێناوی بێوەژن و هەژاردا بە قەد کەسێ پاداشتی بۆ هەیە تێبکۆشێ لەپێناوی خوادا، یان بە قەد کەسێ

بەرۆژ بە رۆژوو بێ بە شەو شەونوێژ بکات پاداشتی بۆ هەیە).

١٩٦٩م- حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ، عَنْ أَبِي الغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ ذَلِكَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَأَبُو الغَيْثِ اسْمُهُ سَالِمٌ مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ مُطِيعٍ وَثَوْرُ بْنُ زَيْدٍ مَدَنِيٌّ وَثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ شَامِيٌّ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕوو خۆشی و گەشاوەیی

٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طَلَاقَةِ الوَجْهِ وَحُسْنِ البِشْرِ

١٩٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُنْكَدِرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَإِنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ، وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ أَخِيكَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتـە: لـە جـابیری کـوڕی (عبـد الله)وە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم فەرموویـەتی: (هـەموو چـاکەکردنێك خێـر و سـەدەقەیە، بێگومـان لـە چـاکە حیسـاب دەکرێـت ئەگـەر بەڕوویەکی خۆش و گەشـەوە بـڕۆی بـەرەوپیری بـرا موسـوڵمانەکەت، وە ئەگـەر لـە دۆڵچەکەی خۆت ئاوی بۆ بخەیتە دەفر و جامـەکەیەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕاستگۆیی و درۆزنی

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصِّدْقِ وَالكَذِبِ

١٩٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى البِرِّ، وَإِنَّ البِرَّ يَهْدِي إِلَى الجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالكَذِبَ فَإِنَّ الكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الفُجُورِ، وَإِنَّ الفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ العَبْدُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّابًا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَعُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە ئاگادربن راستگۆبن، چونکە بەڕاستی راستگۆیی مرۆڤ دەبات بەرەو خێر و چاکە، خێر و چاکەش دەیبەن بەرەو بەهەشت، پیاو بەردەوام ئەوەندە راستی دەڵێ تا لای خوای گەورە بە راستگۆ دێتە هەژمار و ناوی لەریزی راستگۆیان دەنوسرێ، هەروەها ئێوە ئاگادربن و خۆتان بپارێزن لە درۆکردن، چونکە بەڕاستی درۆکردن مرۆڤ دەبات بەرەو خراپەو تاوان، خراپەو تاوانیش دەیبەن بەرەو ئاگری دۆزەخ، پیاو بەردەوام ئەوەندە درۆدەکات تا لای خوای گەورە بەدرۆزن دێتە هەژمار و ناوی لەریزی درۆزنان دەنوسرێ).

١٩٧٢ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ الرَّحِيمِ بْنِ هَارُونَ الغَسَّانِيِّ، حَدَّثَكُمْ عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي رَوَّادٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا كَذَبَ العَبْدُ تَبَاعَدَ عَنْهُ الْمَلَكُ مِيلاً مِنْ نَتْنِ مَا جَاءَ بِهِ؟ قَالَ

يَحْيَى: فَأَقَرَّ بِهِ عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ هَارُونَ، فَقَالَ: نَعَمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ تَفَرَّدَ بِهِ عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ هَارُونَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کاتێ بەندەیە درۆیەکی کرد مەلائیکە میلێ لێی دووردەکەونەوە لەبەر بۆنی پیسی ئەو درۆیەی).

١٩٧٣ - (إسناده صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا كَانَ خُلُقٌ أَبْغَضَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم مِنَ الْكَذِبِ، وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُحَدِّثُ عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم بِالْكِذْبَةِ فَمَا يَزَالُ فِي نَفْسِهِ حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ أَحْدَثَ مِنْهَا تَوْبَةً. قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم رقی لە هیچ کردار و ڕەفتارێکی ناشیرین نەبووە هێندەی درۆکردن، بێگومان پیاوی وا هەبوو لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم درۆی دەکرد دەبووە گرێ لە دڵیدا و خۆی بە تاوانبار دەزانی هەتا تەوبەی دەکرد).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هەرزەگۆیی و هەرزەیی

٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الفُحْشِ وَالتَّفَحُّشِ

١٩٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا كَانَ الفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ، وَمَا كَانَ الحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرزەگۆیی و لەهەر شتێکدا هەبوو ناشیرینی دەکات، حەیاو شەرم و شکۆش لەهەر شتێکدا هەبوو جوانی دەکات).

١٩٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ يُحَدِّثُ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقًا، وَلَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (باشترین کەستان ئەو کەسانەن کە خوڕەوشت و ئاکاریان جوانە). پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زمان پاك بوو، هەرزەگۆو هەرزە نەبوو).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی نەفرەتکردن لەیەك

### ٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اللَّعْنَةِ

١٩٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَلاَعَنُوا بِلَعْنَةِ اللهِ، وَلاَ بِغَضَبِهِ، وَلاَ بِالنَّارِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە یەکتر مەڵێن بەر نەفرەتی خوا کەوی یان نەفرەتی خوات لێ بێ، یان بەر خشم و قین و تووڕەیی خوا بکەوی، یا خوای گەورە بتخاتە ئاگری دۆزەخەوە).

١٩٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى الأَزْدِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلاَ اللَّعَّانِ وَلاَ الفَاحِشِ وَلاَ البَذِيءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باوەڕدار توانجدەر و نەفرەتکەر و هەرزەگۆ و زمان پیس نیە).

١٩٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبَانُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً لَعَنَ الرِّيحَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لاَ تَلْعَنِ الرِّيحَ فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ، وَإِنَّهُ مَنْ لَعَنَ شَيْئًا لَيْسَ لَهُ بِأَهْلٍ رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا أَسْنَدَهُ غَيْرَ بِشْرِ بْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی لە با کرد، فەرمووی: (نەفرەتی لێ مەکە چونکە ئەو بایە لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە، هەرکەس نەفرەت لەشتێ بکا ئەو شتە شایەنی ئەو نەفرەتە نەبێ ئەوە نەفرەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی).

## دەربارەی ناسینی خزمان و ڕەچەڵەك

٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ النَّسَبِ

١٩٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عِيسَى الثَّقَفِيِّ، عَنْ يَزِيدَ، مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَعَلَّمُوا مِنْ أَنْسَابِكُمْ مَا تَصِلُونَ بِهِ أَرْحَامَكُمْ، فَإِنَّ صِلَةَ الرَّحِمِ مَحَبَّةٌ فِي الأَهْلِ، مَثْرَاةٌ فِي الْمَالِ، مَنْسَأَةٌ فِي الأَثَرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَمَعْنَى قَوْلِهِ: مَنْسَأَةٌ فِي الأَثَرِ يَعْنِي زِيَادَةً فِي الْعُمُرِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خزمان و ڕەچەڵەکی خۆتان بناسن چونکە ئەوە دەبێتەهۆی بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، بێگومان بەجێهێنانی سیلەی ڕەحمیش دەبێتەهۆی خۆشەویستی نێوان خزمان و کەسوکار و، زۆریماڵ و سامان و، تەمەن درێژی).

## دەربارەی پاڕانەوەی برا بۆ براکەی بە پەنهانی

٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دَعْوَةِ الأَخِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الغَيْبِ

١٩٨٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زِيَادِ بْنِ أَنْعُمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا دَعْوَةٌ أَسْرَعَ إِجَابَةً مِنْ دَعْوَةِ غَائِبٍ لِغَائِبٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالأَفْرِيقِيُّ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ وَهُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زِيَادِ بْنِ أَنْعُمٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ هُوَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيُّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ پاڕانەوەیە هێندەی پاڕانەوەی

نادیار بۆ نادیار خێرا وەرناگیرێت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی جنێودان

٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّتْمِ

١٩٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ، فَعَلَى البَادِي مِنْهُمَا مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو دوو کەسەی جنێو بە یەکتر دەدەن گوناهی ئەو جنێوانە لە ئەستۆی ئەوەیانە لەپێشدا جنێو دەدات، بە مەرجێ ستەم لێ کراوەکە یان ئەوی تریان دەستدرێژی نەکات و وەڵام نەداتەوە).

١٩٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ فَتُؤْذُوا الأَحْيَاءَ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَصْحَابُ سُفْيَانَ فِي هَذَا الحَدِيثِ، فَرَوَى بَعْضُهُمْ مِثْلَ رِوَايَةِ الحَفَرِيِّ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يُحَدِّثُ عِنْدَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ.

واتە: لە زیادی کوڕی عیلاقەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە موغیرەی کوڕی شوعبە بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (جنێو مەدەن بە مردووان چونکە ئەو جنێوە زیندووەکان ئازاردەدات).

٥٢ - بَابٌ

١٩٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زُبَيْدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ قَالَ زُبَيْدٌ: قُلْتُ لأَبِي وَائِلٍ: أَأَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ عَبْدِ اللهِ؟ قَالَ نَعَمْ. هذا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جنێودان بە موسوڵمان فیسق و لەڕێ دەرچوونە، جەنگ کردن لەگەڵیا کوفرە). زوبەید بە ئەبو وائیلی فەرموو: تۆ ئەمەت لە (عبد الله) بیست؟ فەرمووی: بەڵێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەی چاك

٥٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ الْمَعْرُوفِ

١٩٨٤ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لِمَنْ أَطَابَ الكَلَامَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ فِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ هَذَا مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ، وَهُوَ كُوفِيٌّ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ القُرَشِيُّ مَدَنِيٌّ وَهُوَ أَثْبَتُ مِنْ هَذَا، وَكِلاَهُمَا كَانَا فِي عَصْرٍ وَاحِدٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەهەشت ژوورهای وەهای

تێدایە لەدەرەوە ناوەوەیان دەبینرێت و لەناوەوە دەرەوەیان دەبینرێت). عەرەبێکی دەشتەکی هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوە بۆ کێ دەبێت. فەرمووی: (بۆ ئەو کەسەی کە گوفتاری شیرینەو قسەی چاك دەکات، خواردن دەدات بە هەژاران و، زۆر بە رۆژوو دەبێ و، شەونوێژ دەکات لەکاتێکدا کە خەڵك خەوتوون).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەندەی چاك و صاڵح

### ٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ

١٩٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نِعِمَّا لأَحَدِهِمْ أَنْ يُطِيعَ رَبَّهُ وَيُؤَدِّيَ حَقَّ سَيِّدِهِ يَعْنِي الْمَمْلُوكَ وَقَالَ كَعْبٌ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي مُوسَى، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین بەندە ئەو بەندەیە کە گوێڕایەڵی پەروەردەکارەکەی دەکات و مافی گەورەکەی جێبەجێ دەکات). کەعب فەرمووی: خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم راستیان فەرمووە.

١٩٨٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي اليَقْظَانِ، عَنْ زَاذَانَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثَةٌ عَلَى كُثْبَانِ الْمِسْكِ، أُرَاهُ قَالَ، يَوْمَ القِيَامَةِ: عَبْدٌ أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، وَرَجُلٌ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ بِهِ رَاضُونَ، وَرَجُلٌ يُنَادِي بِالصَّلَوَاتِ الخَمْسِ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ

حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي الْيَقْظَانِ، وَأَبُو الْيَقْظَانِ اسْمُهُ عُثْمَانُ بْنُ قَيْسٍ، وَيُقَالُ: ابْنُ عُمَيْرٍ وَهُوَ أَشْهَرُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سێ کەس لە رۆژی قیامەتدا لەسەر گردۆلکەی میسکن: بەندەیە مافی خواو مافی گەورەکەی جێبەجێ دەکات، پیاوێ پێشنوێژی بۆ قەومێ بکات و ئەوان لێی رازی بن، پیاوێ پێنج فەرزە بانگ بدات و خەڵك بانگ بکات بۆ نوێژ).

## دەربارەی کردار و رەفتاری جوان لەگەڵ خەڵك

٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مُعَاشَرَةِ النَّاسِ

١٩٨٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مَيْمُونِ بْنِ أَبِي شَبِيبٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اتَّقِ اللهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، وَأَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حَبِيبٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، قَالَ مَحْمُودٌ: وَحَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مَيْمُونِ بْنِ أَبِي شَبِيبٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، قَالَ مَحْمُودٌ: وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (لە خوا بترسە لەهەرکوێ هەیت، بەدوای هەر خراپەیەکدا چاکەیە بکە بۆ ئەوەی خراپەکە بسڕێتەوە، لەگەڵ خەڵکدا بە جوانی رەفتار و مامەڵە بکە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گومانی خراپ

٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ظَنِّ السُّوءِ

١٩٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الحَدِيثِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَسَمِعْتُ عَبْدَ بْنَ حُمَيْدٍ يَذْكُرُ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ سُفْيَانَ، قَالَ: قَالَ سُفْيَانُ: الظَّنُّ ظَنَّانِ: فَظَنٌّ إِثْمٌ، وَظَنٌّ لَيْسَ بِإِثْمٍ، فَأَمَّا الظَّنُّ الَّذِي هُوَ إِثْمٌ فَالَّذِي يَظُنُّ ظَنًّا وَيَتَكَلَّمُ بِهِ، وَأَمَّا الظَّنُّ الَّذِي لَيْسَ بِإِثْمٍ فَالَّذِي يَظُنُّ وَلاَ يَتَكَلَّمُ بِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن و دووربن لە گومان، چونکە گومانی خراپترین درۆی رووتە). سوفیان دەڵێ: گومان دوو جۆرە: گومانی خراپ ئەوەیە کە دەردەبڕێت ئەوە گوناهە، گومانێ کە دەرنەبڕێت گوناه نیە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گاڵتەکردن

٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمِزَاحِ

١٩٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الوَضَّاحِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى إِنْ كَانَ لَيَقُولُ لأَخٍ لِي صَغِيرٍ: يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَهُ. وَأَبُو التَّيَّاحِ اسْمُهُ يَزِيدُ بْنُ حُمَيْدٍ الضُّبَعِيُّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە تێکەڵی دەکردین

هەتا برایەکی بچوکمان هەبوو ناوی عومەیر بوو باڵندەیەکی بچوکی هەبوو ناوی نوغەیر بوو بە گاڵتەوە پێی دەفەرموو: (ئەی عومەیر نوغەیر چی کرد).

١٩٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ الْبَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْحَسَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا، قَالَ: إِنِّي لاَ أَقُولُ إِلاَّ حَقًّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، تۆش گاڵتەمان لەگەڵ دەکەی؟ فەرمووی: (بەڵێ، بەلاّم من هەق نەبێ نایڵێم).

١٩٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْوَاسِطِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلاً اسْتَحْمَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ النَّاقَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای وشترێکی لێ کرد بۆ سواری، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من بەچکە وشترێکی مێینەت دەدەمێ)، وتی: جا چی لێ بکەم بەکەڵکی سواری نایەت؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی ئایا گەورەو بچوکیان بەچکەی وشتری مێ نین).

١٩٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: يَا ذَا الأُذُنَيْنِ، قَالَ مَحْمُودٌ: قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: يَعْنِي مَازَحَهُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە گاڵتەوە پێی فەرمووە: (ئەی خاوەنی دوو گوێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مشتومڕ

٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمِرَاءِ

١٩٩٣ - (ضعف بهذا اللفظ) حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ العَمِّيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي سَلَمَةُ بْنُ وَرْدَانَ اللَّيْثِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَرَكَ الكَذِبَ وَهُوَ بَاطِلٌ بُنِيَ لَهُ فِي رَبَضِ الجَنَّةِ، وَمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَهُوَ مُحِقٌّ بُنِيَ لَهُ فِي وَسَطِهَا، وَمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ بُنِيَ لَهُ فِي أَعْلاَهَا. وَهَذَا الحَدِيثُ حَدِيثٌ حَسَنٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَلَمَةَ بْنِ وَرْدَانَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس تەركی درۆیە بكات لەكاتێكدا كە درۆكە پڕوپوچ و باتڵە لەچواردەوری بەهەشت بینایەكی بۆ دروست دەكرێت، هەركەس تەركی (موجادەلە)مشتومڕ بكات لەكاتێكدا كە لەسەر هەق بێ لەناوەڕاستی بەهەشتدا بینایەكی بۆ دروست دەكرێت، هەركەس خوڕەوشت و ئاكاری جوان بێ لەبەشی سەرەوەی بەهەشتدا بینایەكی بۆ دروست دەكرێت).

١٩٩٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا فَضَالَةُ بْنُ الفَضْلِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ ابْنِ وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَفَى بِكَ إِثْمًا أَنْ لاَ تَزَالَ مُخَاصِمًا. وَهَذَا الحَدِيثُ حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەندە بەسە بۆ گوناهباری ئادەمیزاد کە بەردەوام دەمەقاڵێ و دژایەتی بکات).

١٩٩٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنِ اللَّيْثِ وَهُوَ ابْنُ أَبِي سُلَيْمٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تُمَارِ أَخَاكَ، وَلاَ تُمَازِحْهُ، وَلاَ تَعِدْهُ مَوْعِدًا فَتُخْلِفَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَعَبْدُ الْمَلِكِ عِنْدِي هُوَ ابْنُ أَبِي بَشِيرٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مشتومڕ لەگەڵ برا موسوڵمانەکەت مەکە، گاڵتەی لەگەڵ مەکە بەشێوەیە کەپێی ناخۆش بێ، بەڵێنێکی پێ مەدە جێبەجێی نەکەی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێکەوە ژیان

٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُدَارَاةِ

١٩٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا عِنْدَهُ فَقَالَ: بِئْسَ ابْنُ العَشِيرَةِ أَوْ أَخُو العَشِيرَةِ ثُمَّ أَذِنَ لَهُ،

فَأَلاَنَ لَهُ الْقَوْلَ، فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، قُلْتَ لَهُ مَا قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: : پیاوێ داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی بچێتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، فەرمووی: (ڕێگەی بدەن با بێتەژوورەوە بەڕاستی کابرایەکی خراپە لەناو قەومەکەیدا). لەپاشدا ڕێگەیان پێ دا هاتەژوورەوە بۆ خزمەتی رووی خۆش بوو بەرامبەری، کاتێ کە ڕۆشت، پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، تۆ پێشتر قسەیەکی ئاوات دەکرد دەربارەی کە کابرایەکی خراپە کەچی ئێستا بە هێمنی و نەرمونیانی لەگەڵی دەدوێی؟ فەرمووی: (خراپترین پایە لەڕۆژی قیامەتدا لەلای خوای گەورە پایەی ئەو کەسەیە کە خەڵك لەترسی هەرزەگۆی و زمان پیسی وازی لێ بهێنن و خۆیانی لێ بپارێزن).

## دەربارەی میانەڕەوی لە خۆشەویستی و رق و کینەدا

٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الاِقْتِصَادِ فِي الحُبِّ وَالبُغْضِ

١٩٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ عَمْرٍو الكَلْبِيُّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أُرَاهُ رَفَعَهُ، قَالَ: أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْنًا مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْمًا مَا، وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْنًا مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْمًا مَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ أَيُّوبَ، بِإِسْنَادٍ غَيْرِ هَذَا رَوَاهُ الحَسَنُ بْنُ أَبِي

جَعْفَرٍ وَهُوَ حَدِيثٌ ضَعِيفٌ أَيْضًا، بِإِسْنَادٍ لَهُ عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّحِيحُ عَنْ عَلِيٍّ مَوْقُوفٌ قَوْلُهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خۆشەویستەكەت ئەوەندە خۆش بوێت بەشی دوژمنایەتی تێدا بهێڵەوە چونكە لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێتە دوژمنت، ئەوەندە رقت لە دوژمنەكەت بێ بەشی دۆستایەتی تێدا بهێڵەوە چونكە لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێتە دۆستی گیانی بە گیانیت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆبەگەورەزانین

٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكِبْرِ

١٩٩٨ - حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، وَأَبِي سَعِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ سەنگی دەنكە خەرتەلەیە خۆبەگەورەزانینی لە دڵدا بێ ناچێتە بەهەشتەوە، هەركەسێ سەنگی دەنكە خەرتەلەیە ئیمانی دڵدا بێ ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە).

١٩٩٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبَانَ بْنِ تَغْلِبَ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ

عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ، يَعْنِي، مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ، قَالَ: فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: إِنَّهُ يُعْجِبُنِي أَنْ يَكُونَ ثَوْبِي حَسَنًا وَنَعْلِي حَسَنَةً، قَالَ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الجَمَالَ، وَلَكِنَّ الكِبْرَ مَنْ بَطَرَ الحَقَّ وَغَمَصَ النَّاسَ وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي تَفْسِيرِ هَذَا الحَدِيثِ: لاَ يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ، إِنَّمَا مَعْنَاهُ لاَ يُخَلَّدُ فِي النَّارِ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ وَقَدْ فَسَّرَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ التَّابِعِينَ هَذِهِ الآيَةَ: (رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ) فَقَالَ: مَنْ تُخَلِّدُ فِي النَّارِ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیە خۆبەگەورەزانینی لە دڵدا بێ ناچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیە ئیمانی دڵدا بێ ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە). پیاوێ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من حەزدەکەم جل و بەرگ و تەنانەت نەعلەکانیشم جوان و کەشخە بن ئایا ئەوە لە خۆ بەگەورەزانینەوەیە؟ فەرمووی: (نا خوای گەورە خۆی جوانە و شتی جوانی خۆش دەوێ، بەڵکو خۆ بەگەورەزانین هەق پێشێل کردن و خەڵك بە سوك دانانە).

٢٠٠٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَزَالُ الرَّجُلُ يَذْهَبُ بِنَفْسِهِ حَتَّى يُكْتَبَ فِي الجَبَّارِينَ فَيُصِيبُهُ مَا أَصَابَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای

لێی بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاو بەردەوام ئەوەندە خۆی بەگەورەدەزانێ هەتا لەڕیزی ستەمکاران و خۆبەگەورەزانان هەژمار دەکرێت – وەك فیرعەون و هامان و قاروون - ئەوەی ئەوان تووشی دەبن لەسزاو تۆڵە ئەویش تووشی دەبێت).

٢٠٠١ - **(صحيح الإسناد)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عِيسَى البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: يَقُولُونَ لِي: تَكُونُونَ فِي التِّيهِ وَقَدْ رَكِبْتُ الحِمَارَ وَلَبِسْتُ الشَّمْلَةَ وَقَدْ حَلَبْتُ الشَّاةَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا فَلَيْسَ فِيهِ مِنَ الكِبْرِ شَيْءٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێم دەڵێن: تۆ خۆت بەگەورە دەزانیت، بێگومان سواری کەر دەبم و بە پۆشاکەکەم خۆم دادەپۆشم و پۆشاك دەپێچمەوە بە خۆمەوە، بزن و مەڕ دەدۆشم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەوەی ئەم کارانە ئەنجام بدات بە هیچ شێوەیە خۆی بەگەورە نازانێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خوڕەوشت و ئاکاری جوان

٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ الخُلُقِ

٢٠٠٢ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا شَيْءٌ أَثْقَلُ فِي مِيزَانِ الْمُؤْمِنِ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُبْغِضُ الفَاحِشَ البَذِيءَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ، وَأُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی لەڕۆژی قیامەتدا هیچ شتیٚ لە خورەوشت و ئاکاری جوان قورستر نیە لەسەر تەرازووی کردەوەکان، بێگومان خوای گەورە رقی لە کەسی هەرزەگۆ و زمان درێژە).

٢٠٠٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ اللَّيْثِ الكُوفِيُّ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الخُلُقِ، وَإِنَّ صَاحِبَ حُسْنِ الخُلُقِ لَيَبْلُغُ بِهِ دَرَجَةَ صَاحِبِ الصَّوْمِ وَالصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی هیچ شتیٚ لە خورەوشت و ئاکاری جوان قورستر نیە لەسەر تەرازووی کردەوەکان، بێگومان پلەی کەسی خاوەن خورەوشت و ئاکاری جوان دەگاتە پلەی بەرزی کەسی خاوەن نوێژ و رۆژوو).

٢٠٠٤ – (حسن الإسناد) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الجَنَّةَ، فَقَالَ: تَقْوَى اللهِ وَحُسْنُ الخُلُقِ، وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ، فَقَالَ: الفَمُ وَالفَرْجُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ هُوَ ابْنُ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَوْدِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی زۆرترینی ئەو کەسانەی کە دەچنە بەهەشتەوە کێن لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ئەوانەن کە خۆپارێزن لە هاوبەش بۆ خوا

دانان و خاوەن تەقوان و خوڕەوشت و ئاكاریان جوانە). هەروەها دەربارەی زۆرترینی ئەو كەسانەی كە دەچنە دۆزەخەوە لـە پێغەمبـەری خوایـان صـلی الله علیـه وسـلم پرسی؟ فەرمووی: (زۆربەیان لەسەر زمان و شەرمگەیان دەچنە دۆزەخەوە).

٢٠٠٥ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو وَهْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، أَنَّهُ وَصَفَ حُسْنَ الخُلُقِ فَقَالَ: هُوَ بَسْطُ الوَجْهِ، وَبَذْلُ الْمَعْرُوفِ، وَكَفُّ الأَذَى.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی موبارەكەوە دەگێڕنەوە، كە وەسفی خوڕەوشت و ئاكاری جوانی كردووە فەرموویەتی: بریتیە لـە رووخۆشـی و چـاكەكردن بەدەسـت و بە زمان و وازهێنان لە ئازاردانی خەڵك.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاكە و لێ بووردن

## ٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِحْسَانِ وَالعَفْوِ

٢٠٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالُوا: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، الرَّجُلُ أَمُرُّ بِهِ فَلاَ يَقْرِينِي وَلاَ يُضَيِّفُنِي فَيَمُرُّ بِي أَفَأُجْزِيهِ؟ قَالَ: لاَ، أَقْرِهِ قَالَ: وَرَآنِي رَثَّ الثِّيَابِ، فَقَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ مَالٍ؟ قُلْتُ: مِنْ كُلِّ الْمَالِ قَدْ أَعْطَانِيَ اللَّهُ مِنَ الإِبِلِ وَالغَنَمِ، قَالَ: فَلْيُرَ عَلَيْكَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو الأَحْوَصِ اسْمُهُ عَوْفُ بْنُ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ الجُشَمِيُّ وَمَعْنَى قَوْلِهِ اقْرِهِ: أَضِفْهُ، وَالقِرَى: هُوَ الضِّيَافَةُ.

واتە: لە ئەبو ئەحوەصەوە، لە باوكیـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم پیـاو هەیـە دەدەم بـەلای ماڵەكەیـدا فـەرموو و میوانـداریم ناكـات، ئەگـەر ئـەویش دای بـەلای ماڵەكەمدا میوانداری نەكەم؟ فەرمووی: (نا تۆ وەك ئەو مەكە و میوانداری بكـە)

وتی: دەمبینی پۆشاکەکەم کۆن بووە و دڕاوە، فەرمووی: (ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟) وتم: بەڵێ خوای گەورە لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێ پێی بەخشیووم لە وشتر و مەڕ و بزن، فەرمووی: (دەی با شوێنەواری ئەو ماڵ و سامانەت پێوە دیار بێ).

٢٠٠٧ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جُمَيْعٍ، عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَكُونُوا إِمَّعَةً، تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنَا، وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ، إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا، وَإِنْ أَسَاءُوا فَلاَ تَظْلِمُوا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (حذيفة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (إِمَّعَة) مەبن، دەڵێن: ئەگەر خەڵك چاك بوون بەرامبەرمان ئێمەش چاك دەبین بەرامبەریان، خۆ ئەگەر زوڵم و ستەمیان لێ کردین ئێمەش زوڵم و ستەمیان لێ دەکەین، بەڵکو خۆتان وا ڕابهێنن ئەگەر خەڵك چاك بن بەرامبەرتان ئێوەش چاك بن بەرامبەریان، خۆ ئەگەر خراپیش بوون ئێوە هەر چاك بن بەرامبەریان و زوڵم و ستەمیان لێ مەکەن).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سەردانی برای موسوڵمان

٦٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي زِيَارَةِ الإِخْوَانِ

٢٠٠٨ - **(حسن)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَالحُسَيْنُ بْنُ أَبِي كَبْشَةَ البَصْرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ السَّدُوسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سِنَانٍ القَسْمَلِيُّ هُوَ الشَّامِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي سَوْدَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

مَنْ عَادَ مَرِيضًا أَوْ زَارَ أَخًا لَهُ فِي اللهِ نَادَاهُ مُنَادٍ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الجَنَّةِ مَنْزِلاً. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَأَبُو سِنَانٍ اسْمُهُ عِيسَى بْنُ سِنَانٍ، وَقَدْ رَوَى حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا مِنْ هَذَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەبەر رەزمەندی خوای گەورە سەردانی نەخۆشێ بکات، یان سەردانی برایەکی موسوڵمانی خۆی بکات مەلائیکەیە بانگی دەکات و بۆی دەپاڕێتەوە و داوای ژیان و گوزەرانێکی خۆشی بۆ دەکات، دەڵێ: لە بەهەشتدا پلەیەکی بەرزت بۆ ئامادە کراوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شەرم و شکۆ

٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَيَاءِ

٢٠٠٩ - (صحيح)حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، وَعَبْدُ الرَّحِيمِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ، وَالإِيمَانُ فِي الجَنَّةِ، وَالبَذَاءُ مِنَ الجَفَاءِ، وَالجَفَاءُ فِي النَّارِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شەرم و شکۆ لە باوەڕەوەیە، ئەهلی باوەڕیش بەهەشتین، زماندرێژی و هەرزەگۆیی لە دڵڕەقیەوەیە، ئەهلی دڵڕەقیش دۆزەخین).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لەسەرخۆیی و پەلەکردن

٦٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّأَنِّي وَالعَجَلَةِ

٢٠١٠ - (حسن) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا نُوحُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِمْرَانَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ الْمُزَنِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: السَّمْتُ الحَسَنُ، وَالتُّؤَدَةُ وَالاِقْتِصَادُ جُزْءٌ مِنْ أَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا نُوحُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِمْرَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَاصِمٍ، وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ.

واتــە: لــە (عبــد الله)ی کــوڕی سەرجیســی موزەنیــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕێبازی چاك و لەسەرخۆیی و میانەڕەوی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارداو بەردەوامبوون لەسەری: بەشێکن لە بیست و چوار بەشی پێغەمبەرایەتی).

٢٠١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ قُرَّةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَشَجِّ عَبْدِ القَيْسِ: إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الحِلْمُ، وَالأَنَاةُ. ناقص وَفِي الْبَابِ عَنِ الأَشَجِّ الْعَصَرِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ئەشەجی عەبدی قەیسی فەرموو: (بەڕاستی دوو ڕەوشتی جوان لەتۆدا هەن خوای گەورە خۆشی دەوێن: هێمنی و لەسەرخۆیی).

٢٠١٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو مُصْعَبٍ الْمَدَنِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمُهَيْمِنِ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الأَنَاةُ مِنَ اللهِ وَالعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي عَبْدِ الْمُهَيْمِنِ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ وَضَعَّفَهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَالأَشَجُّ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ بْنُ عَائِذٍ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەسەرخۆیی لە خوای گەورەوەیە، پەلەکردنیش لە شەیتانەوەیە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی نەرمونیانی

### ٦٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرِّفْقِ

٢٠١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ، وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَجَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو دەرداوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەشێ لە نەرمونیانی پێ بەخشرا ئەوە بێگومان بەشێ لە خێر و چاکەی پێ بەخشراوە، هەرکەس بەشێ لە نەرمونیانی پێ نەبەخشرێ ئەوە بێگومان بەشێ لە خێر و چاکەی پێ نەبەخشراوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پاڕانەوەی ستەم لێکراو

٦٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دَعْوَةِ الْمَظْلُومِ

٢٠١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى اليَمَنِ، فَقَالَ: اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي سَعِيدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو مَعْبَدٍ اسْمُهُ نَافِذٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە دوعاو پاڕانەوەی ستەم لێکراو بترسن چونکە بێگومان پەردە نیە لەنێوان ئەو و خوای گەورەدا).

## دەربارەی خوڕەوشتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

٦٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خُلُقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٢٠١٥ - (صحيح)حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيُّ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشْرَ سِنِينَ فَمَا قَالَ لِي أُفٍّ قَطُّ، وَمَا قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ لِمَ صَنَعْتَهُ، وَلاَ لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِمَ تَرَكْتَهُ،" وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا، وَلاَ مَسَسْتُ خَزًّا قَطُّ وَلاَ حَرِيرًا وَلاَ شَيْئًا كَانَ أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ شَمَمْتُ مِسْكًا قَطُّ وَلاَ عِطْرًا كَانَ أَطْيَبَ مِنْ عَرَقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَالبَرَاءِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم کردووە هەرگیز پێی نەفەرمووم ئاخ لەدەستی تۆ، لەبیرم نایە کە شتێکم کردبێ یان شتێکم

نەکردبێ پێمی فەرمووبێ بۆ ئەمەت کردوە، بۆ ئەوەت نەکردوە، لەهەموو کەس خورەوشتی جوانتر بوو، دەستم نەداوە لە هیچ خەزێ پۆشاکێکە لە خوری و ئاوریشم یان ئاوریشمێ نەرمتر بووبێ لە دەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆنی هیچ عەتر و میسکێکم نەکردووە هێندەی بۆنی ئارەقی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆش بووبێ.

| ٢٠١٦ - (صحيح)حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللهِ الجَدَلِيَّ يَقُولُ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ، عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: لَمْ يَكُنْ فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا وَلاَ صَخَّابًا فِي الأَسْوَاقِ، وَلاَ يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو عَبْدِ اللهِ الجَدَلِيُّ اسْمُهُ عَبْدُ بْنُ عَبْدٍ وَيُقَالُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدٍ. |
|---|

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەبو (عبد الله)ی بەجەلی بوو دەیفەرموو: سەبارەت بە خورەوشتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسی؟ فەرمووی: نە هەرزەو هەرزەگۆ بوو، نە هات و هاواری دەکرد لەبازاڕدا، پاداشتی خراپەی بە خراپە نەدەدایەوە، بەڵکو چاوپۆشی لێ دەکرد.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی پاراستنی بەڵێن و پەیمان

### ٧٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ العَهْدِ

| ٢٠١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، وَمَا بِي أَنْ أَكُونَ أَدْرَكْتُهَا وَمَا ذَاكَ إِلاَّ لِكَثْرَةِ |
|---|

ذِكْرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهَا، وَإِنْ كَانَ لَيَذْبَحُ الشَّاةَ فَيَتَتَبَّعُ بِهَا صَدَائِقَ خَدِيجَةَ فَيُهْدِيهَا لَهُنَّ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: غیرەم نەکردووە بەرامبەر بە هیچ هاوسەرێکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هێندەی خەدیجە ڕەزای خوای لێ بێ، لەکاتێکدا من فریای خەدیجە نەکەوتووم و نەمدیوە، ئەمەش لەبەرئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر ناوی دەبرد و یادی دەکرد، ئەگەر مەڕێکی سەرببڕیایە بەشی دەستەخوشك و ئاشناکانی ئەوی بەدیاری دەنارد.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشتە بەرزەکان

٧١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَعَالِي الأَخْلاَقِ

٢٠١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ بْنِ خِرَاشٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُبَارَكُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ أَحَاسِنَكُمْ أَخْلاَقًا، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ وَالمُتَفَيْهِقُونَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ عَلِمْنَا الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ فَمَا الْمُتَفَيْهِقُونَ؟ قَالَ: الْمُتَكَبِّرُونَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الْمُبَارَكِ بْنِ فَضَالَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرْ

فِيهِ عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ وَهَذَا أَصَحُّ وَالثَّرْثَارُ: هُوَ الكَثِيرُ الكَلاَمِ، وَالمُتَشَدِّقُ الَّذِي يَتَطَاوَلُ عَلَى النَّاسِ فِي الكَلاَمِ وَيَبْذُو عَلَيْهِمْ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خۆشەویسترین كەستان لەلای من و ئەوانەتان كە نزیكن لەمنەوە لەڕۆژی قیامەتدا ئەو كەسانەتانن كە ڕەوشتیان بەرزو جوانە، هەروەها ئەوانەشتان كە زۆر رقم لێیانەو دوورن لەمنەوە لەڕۆژی قیامەتدا ئەو كەسانەتانن كە زۆربڵێن و دەم هەراشن و خۆیان بەگەورە دەزانن).

## دەربارەی نەفرەتكردن و تانەو تەشەردان

## ٧٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اللَّعْنِ وَالطَّعْنِ

٢٠١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَكُونُ الْمُؤْمِنُ لَعَّانًا. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ .. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ بِهَذَا الْإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَكُونَ لَعَّانًا "، وَهَذَا الْحَدِيثُ مُفَسِّرٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی ئیبنو عەباسەوە عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (باوەڕدار نەفرەتكەر نیە). هەروەها فەرموویەتی: (بۆ باوەڕدار ناگونجێ نەفرەتكەر بێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی توڕەبوونی زۆر

٧٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَثْرَةِ الْغَضَبِ

٢٠٢٠ - (صحيح)حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: عَلِّمْنِي شَيْئًا وَلاَ تُكْثِرْ عَلَيَّ لَعَلِّي أَعِيهِ، قَالَ: لاَ تَغْضَبْ، فَرَدَّدَ ذَلِكَ مِرَارًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ تَغْضَبْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ ، وَأَبُو حَصِينٍ اسْمُهُ عُثْمَانُ بْنُ عَاصِمٍ الأَسَدِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاویّ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وتی: شتێكم فێر بكە قورس نەبیّ لەسەرم بەڵكو لەبەری بكەم و پەیڕەوی لیّ بكەم، فەرمووی: (توڕەمەبە). چەند جاریّ پرسیارەكەی دووپات كردەوە هەر پێی فەرموو: (توڕەمەبە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رق خوارنەوە

٧٤ - بَابٌ فِي كَظْمِ الغَيْظِ

٢٠٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو مَرْحُومٍ عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ مَيْمُونٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يُنَفِّذَهُ دَعَاهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى رُءُوسِ الخَلاَئِقِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ فِي أَيِّ الحُورِ شَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە سەهلی كوڕی (مُعَاذ)ی كوڕی ئەنەسی جوهەنیەوە، لە باوكیەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی بتوانیّ رقی خۆی بە یەكیّ بڕێژیّ بەڵام لەبەر رەزامەندی خوای گەورە

رقەکەی بخواتەوە، ئەوە لەرۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار لەناو ئاپۆرای خەڵکدا بە بەرچاوی سەرجەم دروستکراوەکانیەوە بانگی دەکات و خۆی سەر پشك دەکات بە ئارەزووی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت هەڵیبژێرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێزگرتنی گەورە

٧٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِجْلاَلِ الكَبِيرِ

٢٠٢٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ بَيَانٍ العُقَيْلِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الرَّحَّالِ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا أَكْرَمَ شَابٌّ شَيْخًا لِسِنِّهِ إِلاَّ قَيَّضَ اللَّهُ لَهُ مَنْ يُكْرِمُهُ عِنْدَ سِنِّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ هَذَا الشَّيْخِ يَزِيدَ بْنِ بَيَانٍ، وَأَبُو الرِّجَالِ الأَنْصَارِيُّ آخَرُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر لاوێ ڕێزی پیرێ بگرێ لەبەر تەمەن و بەساڵاچویەکەی ئیللا خوای گەورە لاوێکی بۆ دەستەبەر دەکات کاتێ کە پیر بوو ڕێزی لێ دەگرێ).

## دەربارەی ئەو دوو کەسەی قسە لەگەڵ یەك ناکەن

٧٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَهَاجِرَيْنِ

٢٠٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تُفَتَّحُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ فَيُغْفَرُ فِيهِمَا لِمَنْ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ

الْمُهْتَجِرَيْنِ، يُقَالَ: رُدُّوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى فِي بَعْضِ الحَدِيثِ: ذَرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. وَمَعْنَى قَوْلِهِ الْمُهْتَجِرَيْنِ: يَعْنِي الْمُتَصَارِمَيْنِ، وَهَذَا مِثْلُ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو رۆژانێکی دوو شەممان و پێنج شەممان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، لەو دورۆژەدا خوای گەورە لە هەموو بەندەیە خۆش دەبێت بەمەرجێ ئەو بەندەیە هیچ هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ، وە لەو دوو کەسەش خۆش نابێ کە ناکۆکن لەناوخۆیانداو رقیان لە یەکترەو قسە لەگەڵ یەك ناکەن، دەوترێ: وازبهێنن لەو دوو کەسە هەتا ئاشت دەبنەوە ئەو کاتە قەڵەمی عەفو بێنن بەسەر تاوانەکانیاندا). ئەمەش وێنەی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: (بۆ هیچ موسوڵمانێ رەوا نیە لەسێ رۆژ زیاتر دەنگ دانەبڕێ لە برا موسوڵمانەکەی).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئارامگرتن

٧٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّبْرِ

٢٠٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ قَالَ: مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ شَيْئًا هُوَ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ.

وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ مَالِكٍ هَذَا الحَدِيثُ: فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَيُرْوَى عَنْهُ: فَلَمْ أَدَّخِرْهُ عَنْكُمْ وَالْمَعْنَى فِيهِ وَاحِدٌ يَقُولُ: لَنْ أَحْبِسَهُ عَنْكُمْ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چەند کەسێ لە یاریدەدەران هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و داوایان لێ کرد کە شتێکیان بداتێ، ئەویش پێی دان، لەپاشدا هەم داوایان لێکردەوە ئەویش پێی دان، هەتا ئەو ماڵەی لەلای بوو هەمووی تەواو بوو، فەرمووی: (ئەو خێرو خێراتەی لای من بێت لێتانی ناشارمەوە، هەرکەسێ خۆی بەدوربگرێت لە سواڵکردن و لەوەی خوا حەرامی کردوە خوای گەورە سەربەرزی دەکات و دەیپارێزێ، هەرکەسێکیش چاوی لەدەستی کەس نەبێ و بەرچاو تێربێ خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات، وە هەرکەسێ خۆڕاگربێ خوای گەورە سەبر و ئارامی دەداتێ، گەورەترین بەهرەو خەڵاتێ کە بە کەسێ درابێت بەهرەو خەڵاتی ئارامگرتنە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دووڕوو

٧٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ذِي الوَجْهَيْنِ

٢٠٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ ذَا الوَجْهَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَعَمَّارٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خراپترین کەس لەلای خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا کەسی دووڕووە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی دووزمانی

٧٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّمَّامِ

٢٠٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ، قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَذَا يُبَلِّغُ الأُمَرَاءَ الحَدِيثَ عَنِ النَّاسِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ. قَالَ سُفْيَانُ: وَالقَتَّاتُ النَّمَّامُ . وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە هەمامی کوڕی (حارث)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ دای بەلای (حذیفة)ی کوڕی یەماندا، پێی وترا: ئەمە بە ئارەزووی خۆی فەرموودە هەڵدەبەستێ و بە شان و باڵی کاربەدەستاندا هەڵدەدات، (حذیفة) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی زێدەڕۆیی نەکردن لەڕەوانبێژیدا

٨٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العِيِّ

٢٠٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ أَبِي غَسَّانَ مُحَمَّدِ بْنِ مُطَرِّفٍ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الحَيَاءُ وَالعِيُّ شُعْبَتَانِ مِنَ الإِيمَانِ، وَالبَذَاءُ وَالبَيَانُ شُعْبَتَانِ مِنَ النِّفَاقِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي غَسَّانَ مُحَمَّدِ بْنِ مُطَرِّفٍ. وَالعِيُّ قِلَّةُ الكَلاَمِ، وَالبَذَاءُ: هُوَ الفُحْشُ فِي الكَلاَمِ، وَالبَيَانُ: هُوَ كَثْرَةُ الكَلاَمِ مِثْلُ هَؤُلاَءِ الخُطَبَاءِ الَّذِينَ يَخْطُبُونَ فَيُوَسِّعُونَ فِي الكَلاَمِ وَيَتَفَصَّحُونَ فِيهِ مِنْ مَدْحِ النَّاسِ فِيمَا لاَ يُرْضِي اللَّهَ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شەرم و شکۆ و بێ دەنگی دوو بەشن لە باوەڕ، زماندرێژی و زۆر بلێیی و زێدەڕۆیی لەڕەوانبێژیدا دوو بەشن لە دووڕوویی).

٢٠٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَجُلَيْنِ قَدِمَا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ مِنْ كَلاَمِهِمَا، فَالتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ مِنَ البَيَانِ سِحْرًا أَوْ إِنَّ بَعْضَ البَيَانِ سِحْرٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمَّارٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دوو پیاو لە رووی رۆژهەڵاتەوە هاتن وتاریان دا خەڵکەکە زۆر بە لایانەوە سەیر بوو – واتە بە دەربڕینی جوان و ڕەوانبێژیان - ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بەڕاستی قسەی ڕەوان و رونکردنەوەی جوان سیحری تێدایە). یان: (بەڕاستی هەندێ قسەی ڕەوان و رونکردنەوەی جوان سیحرە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆبەکەمگرتن

٨٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّوَاضُعِ

٢٠٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ رَجُلاً بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي كَبْشَةَ الأَنْمَارِيِّ وَاسْمُهُ: عُمَرُ بْنُ سَعْدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ماڵ و سامان بە بەخشین کەم ناکات، هەرکەسێ لەبەر خوا لێبوردنی هەبێ خوای گەورە زیاتر پایەی بەرز دەکات، هەرکەسێ لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێ خوای گەورە زیاتر پایەبەرزی دەکات).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی زوڵم و ستەم

### ٨٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الظُّلْمِ

٢٠٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زوڵم و ستەم تاریکی ڕۆژی قیامەتە).

### دەربارەی وازهێنان لە رەخنەگرتن لە خواردن

### ٨٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ العَيْبِ لِلنِّعْمَةِ

٢٠٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا عَابَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا قَطُّ كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلاَّ تَرَكَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو حَازِمٍ هُوَ الأَشْجَعِيُّ الكُوفِيُّ، وَاسْمُهُ سَلْمَانُ مَوْلَى عَزَّةَ الأَشْجَعِيَّةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرگیز ڕەخنەی لە خواردن نەدەگرت ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگینا وازی لێ دەهێنا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و گەورەیی باوەڕدار

٨٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْظِيمِ الْمُؤْمِنِ

٢٠٣٢ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَكْثَمَ، وَالجَارُودُ بْنُ مُعَاذٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ وَاقِدٍ، عَنْ أَوْفَى بْنِ دَلْهَمٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمِنْبَرَ فَنَادَى بِصَوْتٍ رَفِيعٍ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ، لاَ تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تُعَيِّرُوهُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ قَالَ: وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْمًا إِلَى البَيْتِ أَوْ إِلَى الكَعْبَةِ فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَالمؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللهِ مِنْكِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، وَرَوَى إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ السَّمَرْقَنْدِيُّ، عَنْ حُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، نَحْوَهُ، وَرُوِي عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوُ هَذَا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سکەوتە سەر مینبەر بەدەنگی بەرز فەرمووی: (ئەی ئەو کەسانەی بە زمان موسوڵمانن و باوەڕ نەچوەتە دڵتانەوە، ئازاری موسوڵمانان مەدەن و سەرزەنشتیان مەکەن و قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێن و جاسوسیان بەسەرەوە مەکەن، هەرکەس جاسوسی بەسەر شەرەف و ناموسی برا موسوڵمانەکەیەوە بکات خوای گەورە نەنگیەکانی کەشف دەکات و ئابرووی دەبات با لە کونجی ماڵەکەی خۆشیدا بێت). ڕۆژێ ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ

سەیری کەعبەی کرد فەرمووی: ئای خوای گەورە چەند رێزی لێناوی و چەندە گەورە و بەرێزی بەڵام موسوڵمان لای خوای گەورە گەورەتر و بەرێزترە.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی تاقیکردنەوە**

٨٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّجَارِبِ

٢٠٣٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ حَلِيمَ إِلاَّ ذُو عَثْرَةٍ، وَلاَ حَكِيمَ إِلاَّ ذُو تَجْرِبَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کەسێ نابێتە کەسێکی ئارام و لەسەرخۆ هەتا تێ نەکەوێ، هیچ کەسێ نابێتە کەسێکی دانا هەتا تەجرەبە لە ژیان وەرنەگرێت و تاقی نەکرێتەوە).

**سەبارەت بە کەسێ خۆی وەها نیشان بدات کە شتێکی هەیە بەڵام نەیبێ.**

٨٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَشَبِّعِ بِمَا لَمْ يُعْطَهُ

٢٠٣٤ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أُعْطِيَ عَطَاءً فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ، فَإِنَّ مَنْ أَثْنَى فَقَدْ شَكَرَ، وَمَنْ كَتَمَ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ تَحَلَّى بِمَا لَمْ يُعْطَهُ كَانَ كَلاَبِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَفِي

البَابِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَعَائِشَةَ وَمَعْنَى قَوْلِهِ: وَمَنْ كَتَمَ فَقَدْ كَفَرَ يَقُولُ: قَدْ كَفَرَ تِلْكَ النِّعْمَةَ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ شتێکی پێ بەخشرا لەلایەن کەسێکەوە ئەگەر هەیبوو با پاداشتی بداتەوە بە شتێکی تر، خۆ ئەگەر نەیبوو با سوپاس و ستایشی بکات، ئەگەر سوپاسی کرد ئەوە کەسێکی سوپاسگوزارە، ئەوەی بیشارێتەوە ئەوە کوفری نیعمەتی کردووە، ئەو کەسەی خۆی بڕازێنێتەوە خۆی وەها نیشان بدات کە شتێکی هەیە بەڵام نەیبێ بەو شێوەیە بێت قسەکەی و کردەوەکەی درۆ بێت وەك ئەو کەسە وایە کە خۆی خراپکارەو بەرگی پیاوچاکان دەپۆشێ و فێڵ لە خەڵك دەکات).

٢٠٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ الحَسَنِ الْمَرْوَزِيُّ بِمَكَّةَ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا الأَحْوَصُ بْنُ جَوَّابٍ، عَنْ سُعَيْرِ بْنِ الخِمْسِ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللَّهُ خَيْرًا فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ جَيِّدٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِهِ، وَسَأَلْتُ مُحَمَّدًا فَلَمْ يَعْرِفْهُ. حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ حَازِمٍ البَلْخِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ الْمَكِّيَّ بْنَ إِبْرَاهِيمَ، يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ جُرَيْجٍ الْمَكِّيِّ، فَجَاءَ سَائِلٌ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ لِخَازِنِهِ: أَعْطِهِ دِينَارًا، فَقَالَ: مَا عِنْدِي إِلاَّ دِينَارٌ إِنْ أَعْطَيْتُهُ لَجُعْتَ وَعِيَالُكَ، قَالَ: فَغَضِبَ وَقَالَ: أَعْطِهِ، قَالَ الْمَكِّيُّ: فَنَحْنُ عِنْدَ ابْنِ جُرَيْجٍ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ بِكِتَابٍ وَصُرَّةٍ وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْهِ بَعْضُ إِخْوَانِهِ، وَفِي الكِتَابِ: إِنِّي قَدْ بَعَثْتُ خَمْسِينَ دِينَارًا، قَالَ: فَحَلَّ ابْنُ جُرَيْجٍ الصُّرَّةَ فَعَدَّهَا فَإِذَا هِيَ أَحَدٌ وَخَمْسُونَ دِينَارًا، قَالَ: فَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ لِخَازِنِهِ: قَدْ أَعْطَيْتَ وَاحِدًا فَرَدَّهُ اللَّهُ عَلَيْكَ وَزَادَكَ خَمْسِينَ دِينَارًا.

